

لە چاپکراوەکانی
ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان- عێراق



# سیستمی فیدراڵی لە چەند وڵاتێکی جیهاندا ٢٠٠٥

وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە
مەجید ئاسنگەر
راوێژکار لە پەرلەمانی کوردستان- عێراق

هەولێر/ کوردستان ٢٠٠٨

لە چاپکراوەکانی
ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان- عێراق

# سیستمی فیدڕالی لە چەند وڵاتێکی جیهاندا ٢٠٠٥

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە
مەجید ئاسنگەر
راوێژکار لە پەرلەمانی کوردستان

هەولێر- کوردستان ٢٠٠٨

321 ‎٠٢

ئاسنگەر، مەجید ئەحمەد

سیستەمی فیدراڵی لەچەند وڵاتێکی جیهاندا / مەجید ئەحمەد ئاسنگەر اوەرگێرا. چ١ - هەولێر، پەرلەمانی کوردستان، اچاپخانەی شەهابا، ٢٠٠٨.

١٧٦ لاپەڕە؛ خشتە

١. فیدراڵی ٢. ناونیشان

سیستمی فیدراڵی لەچەند ولاتیکی جیهاندا ٢٠٠٥

وەرگێڕانی: مەجید ئاسنگەر - راوێژکار لە پەرلەمانی کوردستان.

چاپی یەکەم ٢٠٠٨

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

تایپ: شوان علی حاجی

چاپخانەی شەهاب - هەولێر

ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

١٥٩٨ی ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

# ( پێشدەستیی و پێناسەیەك )

**خوێنەری هێژا:**

ئەم پەرتووکەی بەردەستی بەڕێزتان کە، دوا بەدوای وەرگێڕان و بەچاپگەیاندنی هەردوو کتێبی (خودموختاریی هەرێمایەتیی بۆ کەمینە نەتەوەییەکان لەچین)و (یاسای زمانە فەرمییەکان لەچەند وڵاتێکی فرەزماندا) دێت، بریتییە لە وەرگێڕانی پێنج بابەتی نێو کتێبێك بەزمانی ئینگلیزی بەناوی ( Handbook of Federal Countries, 2005) لەبارەی سیستمی فیدرالیزم و گەشەسەندنی لە (۲۵) وڵاتی جیاوازی جیهاندا کە هەر یەکەیان لەلایەن شارەزاو پسپۆڕێکەوە نووسراوە. برای بەڕێزم پەرلەمانتارو پارێزەر (طارق جامبار)، ئەندامی لیژنەی یاسایی لە ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان پەیدایکردبوو، بۆمنی هێناو، وامان بە پەسەندزانی بۆ ئێستا پێنج لەو دەوڵەتانەی وەربگرین و بیکەین بە کوردی، بەتایبەتی ئەوانەی لەرووی پێکهاتەی فرەنەتەوەیی و فرەزمانیی گەلەکەیانەوە بەجۆرێ

خەڵکانی بدەین- بەتایبەتی ئەوانەی پێیانوایە (فیدرالیزم) واتای دابەشکردنی ولاتو جودابوونەوەیەو، پیادەکردنی ئەم سیستەمە لە ولاتدا خێرێکی گەورەو مەزنە حکومەتی نێوەندو نەتەوەی سەردەستی ولات دەیکەنو بە نەتەوەکانی دیکەو بە هەرێمو ناوچەگەلە جۆراجۆرەکانی نیشتمانی دەبەخشن!

ئێمە لەم پەرتووکە دانسقەیەدا پێمانباشبوو باسەکانی لەمەڕ ولاتانی (هیندستان، سویسرا، کەنەدا، ئەفریقیای باشوورو بەلژیکا) بکەینە کوردیو بیخەینە بەردەستو دیدەی بەڕێزتانەوە بەمەبەستی شارەزابوونو بەدەستهێنانی زانیاریی لە بارەیانەوەو، هەوڵدان بۆ سوود لێوەرگرتن بە ئومێدی پێڕەوکردنی ئەو ڕێبازانەی ئەوان گرتوویاننەتەبەر لەپێناو پێشڤەبردنی ولاتەکانیانو دابینکردنی سەرجەم مافەکانی هاونیشتمانانیانداو مسۆگەرکردنی ئاییندەو دوارۆژێکی گەشو ئاسوودەو بەختەوەر بۆ تێکڕای تاکەکانی گەلەکانیان بەبێ فەرقو جیاوازیی. باشتریش دەبوو گەر بکرابایە عەرەبیی هەتا برا عارەبەکانی ئێراقو ناوچەکەو دەرەوەش بیانزانیبایە کە پێڕەوکردنی فیدڕالی لە ئێراقو، ناسینی گەلی کوردو زمانەکەیو هی سەرجەم پێکهاتەکانی دیکەی ئێراق بە ڕەسمییو دانپێدانانیان بە یاسا، هیچ کارێکی نەکردەو سەیر نییەو هیچ منەتێکیشی تێدا نییەو، جگە لە سوود پێبەخشین هەرگیز زیان بە

ولات ناگەیەنێت. لێرەشدا، بەپێویستی دەزانم ئاماژە بە هاوکاریی‌و پشتگیریی لە رادەبەدەری سەرۆکایەتی پەرلەمانی کوردستان‌و بەتایبەتی رۆڵی سەرۆکی پەرلەمان رێزدار کاک (عەدنان موفتی) بدەم بۆ بەگەرمیی بەدەنگەوە هاتنمان‌و ئاسانکاریی‌و یارمەتیدانمان لەپێناو بە ئەنجامگەیاندنی ئەم ئەرکە پیرۆزەی سەرشانماندا، کە هیوادارین مایەی پەسەندکردن‌و رەزامەندیی ئێوەی بەرێزو خۆشەویست بێت‌و، بەم کارە چکۆلانەیەمان کەلێنێکی بچووکمان لە تەلاری رۆشنبیریی میللی‌و کتێبخانەی بێنازی کوردیماندا پڕکردبێتەوە !

**وەرگێڕ/ مەجید ئاسنگەر**

**هەولێر ٢٠٠٨/٥/١٤**

# کــــــەنــــەدا

نووسینیی: دێڤید کامیڕۆن DAVID R. CAMERON

## ١- دیرۆك‌و پەرەنەستاندنی فیدرالیزم

کەنەدا ولاتێکی دیموکراسی پەرلەمانتارییە. سەرۆکی ولات خاوەنـشکۆ (شـاژن ئەلیزابیـسی دووهەمـە) کـە (حـاکمی گـشتیی) لەسـەر ئاسـتی فیـدرالیی لـە کەنـەدا نوێنەریـەتی‌و، لـە هەرێمەکانیـشدا (جێگرەکـانی فەرمانڕەوا) نوێنـەری شـاژنن. رووبـەری ولات لـە (٩) نـۆ ملیـۆن کـم٢ کیلۆمەتر دووجا تێپەردەبێت‌و، دانیشتوانەکانی دەگاتە _٣١) سی‌و یـەك ملیۆن کەس کە زۆربـەیان لـە شـارە گـەورەکان‌و شارۆچـکەکاندا کـە لـە ناوچەیەکی تا ڕادەیـەك باریکۆکـە لـە بـاکووری سـنوورەکانی (USA) دا پەرشو بلاون، ژیان بەسەردەبەن.

کەنەدا بەرەنجامی ئـەو یەکگرتنـەی سـالی (١٨٦٧) ی سـێ کۆلـۆنی بەریتانیە (نۆڤاسکۆتیا، نیووبرانزویك‌و هەرێمی یـەکگرتووی کەنـەدا) لـە ئەمریکای باکووری سەر بـە بـەریتانیادا. (هـەرێمی یـەکگرتووی کەنـەدا پێکهاتوو لە کەنەدای خۆرهـەلات‌و کەنـەدای خۆرئـاوا، ئەوانـەی سـالی ١٨٦٧ بەدواوە بوون بە (کویبیك‌و ئۆنتـاریۆ). شـەش هـەرێمی دیکـەیش

پێوەندیان بــە (کەنــەدا)وە کــردووە:- مانیتۆبــا ١٨٧٠، کۆلۆمبیــای بــەریتانیی ١٨٧١، دوورگــەی شــازادە ئێــدوارد ١٨٧٣، ساسکاچــوان‌و ئەلبێرتا ١٩٠٥، لەگەڵ نیوفاوندلەند لە ساڵی ١٩٤٩دا. وێڕای ئەمانەیش سێ ناوچەی باکوور هەنە (یۆکۆن، ناوچە خۆرئاواییەکانی باکوورو نوناڤیــل کــە ســاڵی ١٩٩٩ لــەوەی دوایيــان جیابۆتــەوە. فیــدرالیزمی کەنــەدا، دابەشبوونی زمانیی لە وڵات کەلە پێوەندیی نێوان زمانەکانی ئینگلیزیی‌و فەرەنسییدا چڕبۆتەوە، هــەروەها دابەشــبوونە کەلتوورییــە ئەتنیکیەکــەش کاریان تێکردووە.

بەهۆی بوونی مێژوویی دوو کۆمەڵگەی سەرەکیی زمــان، کەنــەدا دوو زمانی فەرمی هەیە: فەرەنسیی‌و ئینگلیزیی. ئینگلیزیــی زمــانی دایکــی پتر لە ٦٠٪ سەدا شەستی کەنەدییەکانەو، فەرەنسیش هی نزیکــەی ٢٤٪ یانە کە بە زۆریی لە هەرێمی کویبیکدا چڕبوونەتەوە. بــەهۆی ئــەوەوە کــە سەقامگیریی‌و گەشەسەندنی کەنەدا زۆر پــشتی بــە کۆچــکردن بەســتووە، نزیکەی ١٤٪ ی خەڵکەکان زمــانی دایکــی جوداوازیــان هەنــەو، ســاڵی ١٩٩١ نزیکەی یەك ملیۆن لە دانیشتوانەکانی کەنــەدا ســەلماندبوویان کــە زمانەکانیان بنــەماو ســەرەتای زمــانی خەڵکــە رەســەنەکانی وڵاتەکــەیان هەبووە.

ئابووریی کەنەدا لەنێوان ولاتە پیــشەسازییە خۆرئاواییەکانــدا حەفتــەم گەورەترینیانــەو، کەنــەدا ئەنــدامێکی گرووپــی هەشــتی (G8)ی وڵاتــە

پیشەسازییەکانە. ئاستەنگەکانی بەردەم بازرگانیکردنی نێو دەوڵـەتیی لـە بەینی کەنەداو ولاتانی تردا لەوەتای جەنگی دووەمی جیهانییەوە بەردەوام لـە کەمبوونـەوەدا بـووە. هـەناردەکان نزیکـەی ٤٠٪ی کـۆی بەرهـەمی نیشتمانیی (G.D.P) پێکدەهێنن (یەکێکە لە بەرزترین رادده لە جیهاندا)و بەنزیکەی ٨٠٪ ی ئەو هەناردانە بۆ ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا دەچێت.

لـە راسـتییدا ئـابووریی کەنـەدا بـە توونـدیی بـە ئـابووری ویلایەتـە یەکگرتووەکانـەوە پەیوەسـتە، بەشـێوەیەك هـەردوو ولات بـە حەقیقـەت گەورەترین تەواوکاری بازرگانیی یەکترین. تێکەڵاویی ئابووریی ئـەمریکای بـاکوور لــەرێی رێککــەوتنی بازرگــانیی ئــازادی نێــوان ویلایەتــە یـەکگرتووەکانو کەنـەداوە هەنـدەی تـر زیـادی کـردووە، (سـاڵی ١٩٨٩ ئیمزاکراوە)و، هەروەها (رێککەوتننامــەی بازرگـانیی ئـازادی ئـەمریکای باکوور)- NAFTA- کـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکانو کەنـەداو مەکـسیك بەیەکەوە دەبەستێتەوە (کانوونی یەکەمی ١٩٩٢) جێبەجێکراوە.

سامانی کەنەدا هەر لە دێرزەمانەوە بە سوودوەرگرتن لە قـەبارەی زۆرو زەبەنـدی سەرچـاوە سروشـتییەکانیەوە هـاتووە، ئیمـڕۆش سـێکتەرە پیـشەسازیی‌و تەکنـەلۆجیا هـەرە پێـشکەوتووەکان رۆڵی گـرنگ لــە ئابوورییەك دەبینن کە زۆر پەرەی سەندووەو خۆماڵییە. هـەروەکو پـتر لـە نیـوەی بەرهـەمی ئـابووریی کەنـەدا لــە هەرێمـە ناوەندییـەکانی وەك

(کوێبیك‌و ئۆنتاریۆ) بەرهەم دەهێنرێن، ئەوانەی بەیەکەوە (۸۰٪)ی هێـزو توانستی دروستکردنی وڵاتی کەنـەدا لـەخۆ دەگـرن. وێـڕای گەشـەکردنی ئابووریـیش چوار هێزی مەزن لەجـەنگی دووەمـی جیهانییـەوە ئـەزموونی فیدراڵی کەنەدایان رەنگڕێژکردووە.

یەکەمیان دروستکردنەوە، دوایی سـنووردانان بـۆ سـامانی دەوڵـەتیی کەنەدایە،

دووهەمیان بریتییـە لـە سـەرهەڵدانی شـێوەیەك لـە نەتەوەپەرسـتیی لیبرالی لە شەستەکانی سەدەی بیستدا لـە کوێبیـك، ئـەو هەرێمـەی کـە زۆرینەی دانیـشتووانەکانی فەرەنـسیی زمـانن. شـان بەشـانی ئـەوەیش، هۆکاری سێهەم دێـت کـە بریتیـە لـە پرۆژەگـەلی گرنگـی (بنیاتنانـەوەی هەرێم) لە ژمارەیەك لە هەرێمەکانی کەنـەدادا. چوارەمیـشیان (خواسـتی بەهێزی خۆبەڕێوەربردنە) لەلایەن خەڵکە رەسـەنەکانی وڵاتـەوە. بێگومـان هەر ئەمانە (تەنیا) هێز نـین یـەکێ بتوانـێ دەستنیـشانیان بکـات، وەلێ ئەمانە لەهەموان زیاتر پێوەندییان بەم بارەی فیدرالیزمی کەنەداوە هەیە.

## ۲- بڕگە دەستوورییەکانی پەیوەست بە فیدرالیزم

کەنەدا یەکەم ولات بوو خۆی وەك فیدراسیۆنێکی پەرلەمانیی ناسـاند- واتە سیستمێکی فیدراڵیی کە تیایدا دەسـەڵات لـەنێوان حکوومەتـەکانی ناوەندو هەرێمەکاندا دابەشکراوەو شێوەکانی فەرمانڕەوایەتی هەردوو لایان لەسەر بنەماکانی دیموکراسـی پەرلـەمانیی بەریتانییـدا بـەپێی دەسـتوور

دارێژراون. ئەو سیستەمەی کەنەدا زیاتر مۆدیلێکی دابەشکراو، تا مۆدیلی هاوپشکی فیدرالیی دەخاتەڕوو، کە تیایدا بەشی هێزەکان زۆر بەڕوونی دیاریکراون، لەگەڵ سەربەخۆیی کاروباری باج و باجگریی بۆ هەردوو حکومەتکانو، نوێنەرایەتیکردنێکی بێ هێزو لەرزۆکیش لە ناوەندا.

فیدرالیزمیی پەرلەمانیی کەنەدا حکومەتێکی جێبەجێکاری بەتوانای لە (ئۆتاوا)و لە پایتەختە هەرێمایەتییەکان بەرهەمهێناوە کە –بەستراو بە سیستەمێکی (ئەنجومەنی پیران) بێ دەسەلات- بۆتە هۆکاری بالادەستبوونی پێوەندییەکانی جێبەجێکردن لەنێوان بەشدارەکاندا.

کەنەدا ساڵی ١٨٦٧ وەك فیدراسیۆنێکی ناوەندیی هاتە دامەزراندن، هێزە سەرەکییەکانی ڕۆژانەی لەدەست (ئۆتاوا)دا بوون لەتەك ڕۆڵی چاودێرییەکی هاوپشکی بالاتری بەهێز بۆ (ئۆتاوا) تەرخانکراو لەبەرامبەر هەرێمەکاندا. سەرەڕای بنچینەکانیشی کەنەدا بووەتە ولاتێکی لامەرکەزی، ئەوەیش وەك دەرەنجامی چەند هۆکارێك، یەك: ڕاوبۆچوونو لێکدانەوەی دادگەریی سەبارەت دابەشبوونی هێزەکان زیاتر لە بەرژەوەندیی حکومەتەکانی هەرێمەکان دابوو تا بۆ حکومەتی فیدرال. دوو: دامودەزگە ناوەندییەکانی ولات نەیانتوانیوە بە تەواوەتی نوێنەرایەتی دابەشبوونە هەرێمایەتییەکەی کەنەدا بکەن، بۆیەکا پشتگیرییەکی بەربلاوی گەل بۆ ڕێزگرتن لە هێزی هەرێمایەتی هاتوتە

ئاراوە، بەتایبەتی لە هەرێمە هەرە بەهێزەکاندا. سێهەم: رووبەری بەرپرسیاریەتی هەرێمایەتی لە بابەتگەلی وەك تەندروستی، سامانو پەروەردە، کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا بایەخێکی ئەوتۆی حکومەتییان پێنەدرابوو، لە سەدەی بیستدا ئەو گرنگی پێدانەیان زۆر زیادی کردبوو، بەو شێوەیە رۆڵی هەرێمەکانی ئێجگار بەهێزو کاراکرد. چوارەمیش: هەستی نەتەوەپەرستیی لە (کویبیك) دوای جەنگی دووەمی جیهانیی یارمەتی زۆری بۆ سەپاندنی پرۆسەیەك بۆ کەمکردنەوەی دەسەڵاتەکانی (ناوەند) داوە، هەرێمەکانیش سوودی زۆریان لەمەبینیوە.

دەرەنجام کەنەدا بوو بە خاوەنی حکومەتی زۆر بەهێز لە (ئۆتاوا)و لە هەرێمەکانیشدا کە لەنێوخۆیاندا کەوتنە کێبڕکێی توند بەمەبەستی بنیادنانی کۆمەڵگەو، پەرەپێدانو پێشخستنی کۆمەڵایەتیو ئابووریی لەسەر هەموو ئاستەکاندا. بەڕێوەبردنی ئەم سیستەمە پێویستی بە شێوەگەلی هاوکاریی لەنێوان حکومەتەکاندا هەیەو هەندێ جاریش دەبێتە هۆکاری دروستبوونی ناکۆکییو دژایەتییەکی سەختو تاڵ لە مابەینی حکومەتەکاندا.

دوو بەڵگەنامەی سەرەکیی دەستووریی لەکەنەدا بریتین لە قانوونی دەستووریی ساڵی ١٨٦٧و قانوونی دەستووریی ساڵی ١٩٨٢.

ئەوەی ساڵی ١٨٦٧ کە پێشتر بە (قانوونی باکووری ئەمریکای بەریتانیی) ناسراو بوو، قانوونێکی پەرلەمانی بەریتانیا بوو کە (کەنەدا)ی

لــە ســێ کۆڵۆنیــە ســەرەکییەکاندا پێکهێنــاو بونیــادی فیــدرالیی‌و پەرلەمانیشی پێبەخشی. ئیتر، لەم بەڵگەنامەیەوەیــە کــە مــرۆڤ دەتوانــێ برگەو یاسا گشتییەکان بدۆزێتەوە سەبارەت بە دابەشبوونی دەسەڵاتەکان‌و دامەزراندنی پەرلــەمان‌و، هــەروەها دەزگــەکانی یاســادانان‌و دادگــەکانی هەرێمایەتی. هەرچی یاسای ســاڵی ١٩٨٢یــشە ئــەوا دەســتوورەکەی لــە دوایین قانوونەکانی دەسەڵاتی بەریتانیاییەوە وەرگرتووە لەڕێگای داهێنانی شــێوەیەکی هــەموارکراوی کەنــەدایی بــە دابینکردنــی مافــە بنــەڕەتیی‌و داهێنراوەکان بۆ خەڵکانی رەســەنی کەنــەداو، پێــشکەشکردنی قانوونێــک بەنێوی (پــەیمان. یاســای مــاف‌و ئازادییــەکان) کــە ســەرجەم هاووڵاتیــان دەگرێتــەوەو، هــەموو حکومەتــەکان‌و دەزگــەکانی یاساســازیی پێیــەوە پابەنــدن. ماددەکــانی (٩١- ٩٥)ی قــانوونی دەســتوورەکەی ١٨٦٧ دەسەڵاتەکان لــەنێوان حکومــەتی فیــدراڵ‌و حکومەتــەکانی هەرێمەکانــدا دابەشــدەکات. فــرەوانترین‌و کــاراترینی دەســەڵاتەکانیش بــەر پەرلــەمانی کەنەدا کەوتووەو، هەر دەسەڵاتێکیش بەتایبــەتی‌و بــەبێ زیــادو کــەم لــە دەستووردا دیارنەکرابێ ئەوا بۆ پەرلەمانی فیدراڵی (ناوەند) دەگەڕێتــەوە. بــاقی دەســەڵاتەکانی دیــش بــەروونی‌و تایبــەت بــە هەرێمەکانــەوە دیاریکرابوون. لێکدانەوەی بەرفرەوانی دادگەریی (مافــە شارســتانییەکان‌و مــافی خاوەنداریــەتی زەویــوزار)ی هەرێمــەکانی بــۆ دەســەڵاتی خــۆی گەڕانــدبۆوە. (بەشــی ٩٢ (١٣١) کەچــی دەســەڵاتەکانی بــۆ یاســادانانی

فیدراڵیی بەشێوەیەکی سەرەکی لەبەشی (٩١)ی دەستوورەکەی ساڵی (١٨٦٧)ی کەنەدا دا دەبینرێت کە بە بەخشینی دەسەڵات دەستپێدەکات بەوەی کە: پەرلەمان بۆی هەیە (یاسا دابنێت بۆ ئاشتی، پاراستنی ئاساییش‌و ئاسوودەگیی‌و سوودی حکومەتی کەنەدا) کە پێوەندبن بە گشت بوارێکەوە ئەگەر بە ئەکیدی بۆ ئەنجومەنی یاسادانی هەرێمایەتی تەرخان نەکرابن. دوای ئەوە، یاسادانەرانی دەستوورەکە ٢٩ بیستونۆ سەرناوی هێزیان ریزبەند کردووە کە بەشێك لەو دەسەلاتە سەرەکییانەی پەرلەمان پێکدێنن. لەپاش ساڵی (١٨٦٧)ەوە دادگەکان هەوڵیانداوە واز لەو بۆچوون‌و لێکدانەوە بەرفراوانە بێنن بۆ دەسەڵاتەکانی (حکومەتی ئاشتی‌و ئاساییش‌و رێك‌وپێکی‌و چاك) (POGG) لەجیاتی ئەوەدا متمانەی زیاتریان لەسەر ٢٩ سەرناوەکانی هێزە ئەژمارداراوەکان کردووەو (POGG) یان بە سێ پێگەی سەرەکیی سنووردار کردووە بەم شێوەیە:- لەهەر شوێنێك لە دابەشکردنی دەسەڵاتدا کەلەبەرێ بەرچاو بکەوێت، وەك (سەرچاوەکانی دەرەوەی کەنارەکان، یان سیاسەتەکانی پەیوەست بەزمانی فیدراڵیی)، لە شوێنێك بابەتەکە سەر بە (بەرژەوەندیی نیشتمانیی) بێت‌و لەهیچ کام لە ٢٩ سەرناوەکانی دەسەڵاتی فیدراڵییدا نەهاتبێت، وەکو (هێزەکانی دەریاوانیی‌و فرۆکەوانیی)، یاخود لەهەر جێیەك (نا ئاسایيەکی (پشێویی) نیشتمانیی وەك شڵەژانی باری شارستانیی یان قەیرانێکی ئاڵۆزو سەختی ئابووریی) لە وڵاتدا سەرهەڵبدات.

هەندێ لە سەرناوە ریزکراوە گرنگەکانی هێز، ئەمانەن:

١. رێکخستنی بازرگانی (بەشی ٩١، ٢) ئەوەی لە ئێستادا بازرگانی نێوان هەرێمەکانو بازرگانیی نێودەولەتی دەگرێتەوە لەتەك رێکخستنی گشتیی بازرگانیکردن لە سەرتاسەری وولاتدا.

٢. بیمەی بێکاریی (تأمینکردنی بطالة) (بەشی ٩١، 2A) کە بە قانوونی دەستوور لە سالی ١٩٤٠دا زیادکراوە.

٣. کاروباری باجگریی (وەرگرتنی باج)- (بەشی ٩١، ٣) ئەوەی ماوە بە حکومەتی فیدرال دەدات بڕی داهاتەکان بەرزکاتەوە بەهەر رێگایەكو سیستەمێکی باجدانانەوە بێت.

٤. هیندییەکانو زەویوزاری تەرخانکراو بۆیان- بەشی ٩١ (٢٤).

٥. هێزی رێکەوتننامە (بەشی ١٣٢) کە دەسەلاتی گفتوگۆو ئیمزاکردنی رێککەوتننامە نێودەولەتییەکان بە حکومەتی کەنەدا دەدات بەلام، ئەگەر رێککەوتنێك پێوەندیی بە کاروباری دادوەریی هەرێمایەتییەوە هەبێ ئەوا جێبەجێ ناکرێت هەتا لەلایەن هەرێمەکانەوە بەیاسا پەسند نەکرێت.

٦. هەروەها دەسەلات سەبارەت بە (دراو)و کاروباری بانکەکانو، ترانزیۆرت (گواستنەوە)ی نێوان هەرێمەکانەوە.

شانزە سەرناوی هێز (دەسەلات)ی تایبەتمەندکراو بۆ هەرێمەکان لە (بەشی (۹۲)ی دەستووری ساڵی ۱۸٦۷دا دیاریکراون‌و ئەمانەی خوارەوە گرنگترینیانن:

١. باجگریی راستەوخۆ (بەشی ۹۲، ۲) کە (مافی کاروبارەکانی باجگریی راستەوخۆ لەنێو هەرێمدا دەداتە هەرێمەکان بەمەستی بەرزکردنەوەی بڕی داهاتەکان بۆ خزمەتگوزارییە هەرێمایەتییەکان).

٢. بەڕێوەبردن‌و فرۆشتنی زەوی‌وزاری گشتیی (یان زەوییەکانی تاج) بە سەرچاوە سروشتییەکانەوە لەنێو سنووری هەرێمێکدا موڵکی ئەو هەرێمەن‌و، بەم شێوەیە سەرچاوەیەکی بایەخداری سامان بە هەرێمەکە دەبەخشێت‌و توانای بەڕێوەبردنی ئابووریی هەرێمایەتی بۆ دەستەبەر دەکات.

٣. تەندروستیی‌و خۆشگوزەرانیی (بەشی ۹۲، ۷) ئەو بەرپرسیارییەتیەی لە سەدەی بیستدا گرنگییەکی زۆری بەدەستهێناوە، لە ئێستادا بایەخدان بە لەشساغیی بۆتە تاکە بواری هەرە فرەوانی پارەخەرجکردن بۆ حکومەتە هەرێمایەتییەکان.

٤. دامەزراوە شارەوانییەکان (بەشی ۹۲، ۸) کە ئەوە دەگەیەنێت دەتوانرێت حکوومەتە شارەوانییەکان لەلایەن حکوومەتی هەرێمەوە دابمەزرێن‌و هەڵوەشێنرێتەوەش.

٥. کارگەو کارخانە ناوچەییەکان‌و بەڕێوەبردنیان- بەشی ۹۲ (۱۰).

٦. موڵکایەتیی‌و مافە شارستانییەکان لەنێو سنووری هەرێمدا (بەشی ٩٢(١٣) کە بەشێوەیەکی گشتی بە گرنگترین دەسەڵاتی سەرەکیی هەرێم دادەنرێت، چونکە هەرێمەکان لە رێگەیەوە مافی ئەوەیان دەبێت یاساسازیی پەیوەست بە بواری رۆشنبیریی‌و خاوەنداریەتیی زەوی‌و زارو موڵکی تایبەت‌و مافە شارستانییەکان‌و بابەتگەلی سرووشتی خۆجێیەتی لە سنووری هەرێمایەتی خۆیاندا ئەنجام بدەن.

(بەشی ٩٢ (١٦) کە ئەمەیش بە سەرچاوەیەکی گرنگی دیکەی دەسەڵاتی هەرێماتی دەژمێردرێت، چونکە پەیوەستە بە ئەو بابەتانەی بەشێوەیەکی تایبەتی ناکەونە ژێر هیچ کام لە دەستەڵاتەکانی دیکەوە کە یەك بەیەك بۆ هەرێمەکان دیاریکراون، ئەوانەی سرووشت‌و خەسلەتگەلی خۆجێی‌و تایبەتیان هەیە.

هەروەها چوار هێزی هاوکاریکەری هاوبەشی تایبەتمەند هەیە، یەکەمیان پێوەندیی بە کشتوکاڵ‌و کۆچکردنەوە هەیە (بەشی ٩٥) ئەو بەشە دەسەڵات دەدات بە هەردوك پەرلەمانی فیدراڵ‌و ئەنجوومەنی یاسادانانی هەرێم تا قانوونی پەیوەست بەم بابەتانەوە دەربچوێنن کە ئەنجوومەنی یاسادانانی فیدراڵ لە حاڵەتی رێکنەکەوتندا باڵا دەستتر دەبێت تیایاندا. هێزی دووەم پەیوەستە بە سەرچاوە سروشتیەکان (بەشی ٩٢ ( a)). ئەم بەشەیان لە ئەنجامی گفتوگۆ دەستوورییەکانی ١٩٨٠-١٩٨٢ دا نیزافە کراوە. ئەمەیش رێ بە هەرێم دەدات هەناردەی لە

دارەکانی ئەو جەنگەلانەی کۆنترۆڵ بکات کە ناتوانرێت تازەبکرێنەوەو هەروەها کۆنترۆلکردنی هەناردەی سەرچاوەکانی ووزەی کارەبا (ئەگەرچی نابێ بۆ وڵاتێکی تر بێت)، بەو پێیەش ئەو کۆسپو ئاستەنگانە ناهێڵێت کە پێشتر بەسەریاندا سەپێنرابوون.

لەحاڵەتی ناکۆکییشدا بالادەستیی بۆ پەرلەمانی فیدراڵە.

پانتایی دەسەڵاتی سێهەم پەروەردە دەگرێتەوە (بەشی ٩٣). پەروەردە لەم لیستەدا هاتووە، هەرچەند مافی فیدراڵ (ناوەند) بۆ کارپێکردنی زۆر گشتیی نییە بەڵام، تەنها لەبۆنەی ئێجگار تایبەتمەندەوە دەبێت. پەروەدە بەرپرسیارییەتی هەرێمەکانە بە چەند مەرجێك کە بۆ پاراستنی گرووپە کەمینەکانو سەبارەت بە قوتابخانە جوداوازەکان دانراون، لەتەك دەسەلاتێکی فیدراڵیدا بۆ تێپەڕاندنی یاسازییەکی هەموارکردن (چاکسازیی) کە لەڕاستییدا هەرگیز بەکارنەهێنراوە. پەروەردەش، بەشێوەی لەشساخیی‌و خۆشگوزەرانیی‌و بەختەوەریی بۆتە بەرپرسیارییەتێکی ناوەندیی لە دەوڵەتی دیموکراسی مۆدیرن لەسەدەی بیستەمدا. کەنەدا تەنانەت لەنێو فیدراسیۆنەکانیشدا نا ئاساییە، بەپێدانی دەسەڵاتێکی هێندە کەم لەم رووەوە بە حکومەتی فیدراڵ.

رووبەری هێزی چوارەم بۆ دادگەریی هاوبەش پەیوەستە بە مووچەو مانگانەی خانەنشینییەوە (بەشی ٩٤(a)- ئەم بەشە کە سەرەتا لەساڵی ١٩٥١دا خرایە نێو دەستوورو ساڵی ١٩٦٤ هەموارکراوە، باس لە

دەسەلاتی هاوبەش دەکات بە گرنگی دانو رێزگرتنی خانەنشینکراوە بەسالاچووەکانو بیمەو دەستکەوتە پاشکۆکانیان.

لێرەشدا، لە حاڵەتی رێکنەکەوتن لەنێوان ئەنجوومەنی یاسادانانی هەرێمو فیدراڵدا، بڕیاری کۆتایی بۆ ئەنجوومەنی هەرێمایەتی دەبێت.

وێرای هەبوونی ژمارەیەکی کەمی دەسەلاتی هاوبەش، سێ پانتایی تر هەن کە دەسەلاتەکانی فیدراڵیو هەرێمایەتی تیایاندا تێکەلاون. یەکەمیان (یاسای تاوانکاریی)یە (بەشی ٩١(٢٧)) دەسەلاتی داوەتە پەرلەمان یاسای پەیوەست بە قانوونی تاوانکاریی دابڕێژێت کە پرۆسەو هەنگاوەکانی سەبارەت بە کاروباری تاوانکارانەوەی تیادا دیاریکرابێت، کەچی بەشی (٩٢(١٤)) بەرپرسیارییەتی بەڕێوەبردنو سەرپەرشتیکردنی دادوەریی بە هەرێمەکان ئەسپاردووە.

بەم پێیە، قانوونی تاوانکاریی ئی ناوەندە، بەلام جێبەجێکردنی قانوونەکە لەلایەن پۆلیسەوە بەگوێرەی بڕگەو ماددەکانیی، ئەوە کاری هەرێمەکانە.

دووەمین گۆڕەپان دادگاکانن. کەنەدا سیستمێکی دادوەریی یەکگرتووی هەیە، کە تیایدا حکومەتی ناوەندیی بەرپرسیارە لە دامەزراندن، مووچەو مانگانە، بەخششو خانەنشینی دادوەرانی دادگە باڵاکاندا، لە کاتێکدا هەرێمەکان لە دروستکردنی تەلاری دادگاکانو بەڕێوەبردنیان بەرپرسیارنو،

لەهەمان کاتیشدا بەرپرسیارییەتی تەواویان هەیە بەرامبەر دادگە بەراییەکان لەهەر هەرێمێکدا.

سێهەم مەیدانی تێکەڵاوبوون بریتییە لە هێزی خەرجکردنی ناوەندو بەشداریکردنی لە نرخو تێچووی پرۆگرامەکاندا. یەکێ لە هەرە پانتاییە گرنگەکانی فیدرالیزمی کەنەدی ئەو بەرنامانەن کە تێچووەکانیان هابەشن، واتا، حکومەتی فیدرال پارەو پوول بۆ حکومەتکانی هەرێمەکان دەنێرێت بە مەبەستی هاوکاریکردنیان لە ئەنجامدانی هەندێ لە بەرپرسیارییەتیە دەستوورییەکانیان. لەو رووەوە، بەرفراوانترین پرۆگرامەکان پەیوەستن بە (تەندروستیی، هاوکاریی کۆمەڵایەتی-سۆشیال)و پەروەردەی دوای قۆناخی دواناوەندیی کە لەئێستادا بە بەرنامەکانی (لەشساخییو گواستنەوەی سۆشیالی کەنەدا) وە بەستراون. ئەم پرۆگرامە گوێزانەوەی پارەی کاش (ئەختینە) وباج بە گوژمەی ساڵانەی ٢٥ بیستو پێنج بیلیۆن دۆلاری کەنەدی دەگرێتەوە.

دسەڵاتی حکومەتی فیدرایش بۆ ئەم کارە (هێزی خەرجکردنی پارە) هەر تەنها لە بەشی (٩١)دا روونئەکراوەتەوە، بەڵکو لە چەندین ماددەی قانوونی دەستووری ساڵی ١٨٦٧دا، ئەوانەی بە دەسەڵاتی باجو خەرجییەوە پەیوەستن، وەرگیراوە.

دووەمین ئەنجومەنی باڵای پەرلەمانی کەنەدا سیناتە (thc Senate) ئەمیش (١٠٥) سەدو پێنج ئەندامی هەیە کە حاکمی گشتیی دایاندەنێت

لەسەر پەسەندكردنو راسپاردەی سەرەك وەزیرانەوە، ئەوەیش بەپێی سیستمێكی ئالۆزی نوێنەرایەتیكردنی هەرێمایەتیو رەچاوكردنی لایەنی سیاسی- (زۆربەی كات لە پاداشتی دڵسۆزییو خزمەتگوزاری بۆ حزبی دەسەڵاتدار) ەوە دەبێت.

قانوون دەبێ بە هەردوو ئەنجومەنی گشتییو سیناتدا تێپەربێت، لە راستییدا مافی ڤیتۆ (رەتكردنەوە) بە ئەنجومەنی سینات دراوە، وەلێ، بە كردەوە زۆر كەم ئەو دەسەڵاتەی خۆیی پیادە كردووەو، پێش ناچێت بشیكات. وەك ئەنجومەنێكی دانراو زیاتر لەوەی هەڵبژرێردراوبێت، بەشێوەیەكی سەرەكیی بۆتە ئەنجومەنێك بۆ دەسەڵاتی سەرەك وەزیرەكان قۆرخكراوە،و بەم پێیەش هیچ رەوایەتییەكی (شەرعییەتی) دیموكراتیی بۆنییە.

تا ئێستا زۆران پێشنیاز بۆ هەمواركردنی ئەم سیناتە پێشكەش كراوە، بەتایبەتی بۆ ئەوەی بەشێوازی هەڵبژاردن پێك بهێنرێتو بكرێت بە دەنگێكی كاریگەر بۆ هەرێمەكان لەنێو حكومەتی فیدراڵدا كەچی هیچ هەمواركردنێكی بۆ ئەنجام نەدراوە.

هەتا ساڵی ١٩٤٩ كۆمیتەی دادگەریی بەریتانیی كە بەشێكە لە (ئەنجومەنی لۆرداتی بەریتانیایی) باڵاترین دەسەڵاتێك بووە قانوونی دەستووریی كەنەدای خستۆتە واری پراكتیكەوەو، ناكۆكیەكانی نێوان هەردووك حكومەتەكانی یەكلاییكردۆتەوە. هەر لەو ساڵەوە هیچی تر

داواکاریی بۆ ئەم کۆمیتەیە بەرزنەکرایەوەو، لەو مێژووەوە (دادگەی باڵای کەنەدی) بووەتە تاکە دەسەڵاتی دادوەریی، ئـەوەیش بـەپێی (ئەنجومـەنی یاسادانانی فیدرالی)یەوە دامەزرێنراوە نەك بەگوێرەی برگـەو مادەدەیـەکی دەســتووریی‌و، دادوەرەکانیــشی تــەنها لەلایــەن حکومــەتی کەنــەداوە دادەمەزرێنرێن، بەبێ هیچ رۆلێکــی فــەرمیی هەرێمایــەتی لــەم کــارەدا، ئەگەرچی بەگشتیی دادوەران لەسەر بنەمای رێوشوێنی هەرێمایــەتی دێنــە دامەزراندن.

هەرچەند دەستوور بە پیرۆز راگیراوە، قانوونی دەستووری ســالّی ١٩٨٢ ریگەی بۆ هەمووارکردنی دیاریکردووە، بەم شێوەیە هەموارکردنی دەستوور بوو بە کارێکی کردەنی بەبێ گەڕانەوە بۆ پەرلـەمانیی بـەریتانیایی‌و، بـۆ هەموارکردنەکەیش پێنج شێواز بەگوێرەی بابەتەکانی لە ئارارادان.

بەڵام بەگـشتیی هەموارکردنەکـە پێویــستیی بــە پەســەندکردن هەیــە لەلایــەن پەرلــەمانی کەنــەداوە، لەگــەڵ پەســەندکردنی حــەوت لــە دە ئەنجوومەنەکانی هەرێمەکاندا، کە بەیەکەوە لانی کەم رێژەی ٥٠٪ لەسـەدا پەنجای دانیشتووانانیان هەبێت.

## ٢- هێزی جووڵێنەری رامیاریی سەردەم

لە دەیەی رابردوودا ئەو ریفراندۆمــەی لەمــەڕ ســەربەخۆیی لــەمانگی تەشرینیی یەکەمی سالّی ١٩٩٥ لە ناوچەی (کوبیبك) سازدرا، گرنگترین رووداو بوو لە فیدراسیۆنی کەنەدیدا روویدا.

جـــودا خوازەكـــان بەرێژەيـــەكی زۆر كـــەم دۆڕانو ئەوانـــەی دژی جودابوونەوەی هەرێمەكە لە كەنەدا بوون بـەكۆی ٥٠,٦٪ لەسـەدا پـەنجاو پۆينت شەشی دەنگەكگان برديانەوە. راپرسـييەكە زنجيرەيـەك تەقينـەوەی رامياريی- گەورەو بچووك- لە سيستمی سياسيی كەنەدادا بەرپاكرد. وەك دەرئەنجامێـــك، ژاك پـــارێزۆ- ســـەرەك وەزيرانـــی كويبيـــك دەســـتی لەكاركێشايەوەو، لوسيان بووچارد شوێنەكەی گرتـەوە. بووچـارد تـا ئـەو ساتە سەرۆكی حزبی (بلۆك كويبيكوا) بـوو، كـە خوشـكە حزبـی (پـارتی كويبيكوا)يە لەسەر ئاستی فيدراڵيدا.

دەرەنجامێكی راستەوخۆی ديكەی ريفراندۆكەمە ئـەوەبوو كـە سـەرەك وەزيران كريستيان رێگەی بۆ تێپەڕاندنی دوو بڕياری پەرلەمانی خۆشكرد- يـەكێكيان ناسـاندنی (كويبيـك)ە وەك كۆمەڵگەيـەكی ديـارو جيـاوازی تايبەتو، ئەويتريان بەڵێندان بە پێدانی مافی (ڤيتۆ)يەك لەسـەر بنـەمای (ئـەمری واقيـع) بـۆ كويبيـك لەهـەر هـەمواركردنێكی دەسـتووريی لـە ئاييندەدا. هەروەها حكومـەتی فيـدراڵ بەرپرسـيارييەتی چـەندين بـواری رامياريی بـۆ هەرێمـەكان گوێزرايـەوە، بەشـێوەيەكی سـەرەكيی هـی ئـەو بابەتانەی زەمانێكی درێژو لەمێژە جێی بايەخپێدانی حكومەتە يەك لەدوا يەكەكانی (كويبيك) بوونە.

بۆ رەواندنەوەو نـەهێڵانی ئـاژاوەی گـشتيی لـە (كويبيـك) دەربـارەی دەرەنجامەكانی هەر ريفرانـدۆمێكی پـۆزەتيڤ لـە ئاييـندەدا، حكومـەتی

ناوەند پرسیاری لە (دادگەی بالاّی کەنەدا) کردووە، ڕوونی بکاتەوە ئایا (کویبیك) بە حوکمی هیچ یاسایەکی نێوخۆیی یان نێودەوڵەتییەوە، ئەو مافەی هەبووە یەك لایەنە جودابێتەوە (لە کەنەدا)؟ جێگەی سەرسوڕمان نییە کە (دادگە) لە رایەکی خۆیدا لە مانگی ئابی (١٩٩٨) گوتوویەتی(کویبیك) ئەو جۆرە مافەی نەبووەو، جیابوونەوەی هەر هەرێمێك پێویست بە گفتوگۆ دەکات لەبەر ڕۆشنایی ماددەکانی پەیوەست بە هەمووارکردنی دەستووری کەنەدادا.

لەوەیش سەیرتر (دادگە)کە روونیکردەوە کە دەنگدانێکی بەهێزی کاریگەر لەسەر (پرسیارێکی روون) لە راپرسیەکی داهاتووی (کویبیك)دا دەخوازێ کە حکومەتی فیدراڵو هەرێمەکانی تر گفتوگۆی ئەم بابەتە لەگەڵ (کویبیك)دا ئەنجام بدەن.

جا، بە جەختکردنی (دادگە) لەسەر پێویستی هەبوونی دەنگدانێکی روونو پرسێکی روون، حکومەتی فیدراڵ پڕۆژە یاسایەکی بەناوی ( Clarity Bill)- یاسای روونکردنەوەی هەڵوێست- لە پەرلەمانی کەنەداوە دەرچوواند. ئەم قانوونە ئەم هەنگاوانە دیاردەکات کە بەهۆیانەوە (ئۆتاوا) بڕیاری ئەوە بدات پرسیارو کێشەی راپرسییەکی ناییندەو، ئەو دەنگی زۆرینەیەی بەدەستی دەهێنێت راستو (روون) دەبن.

کەچی (کویبیك) لەلای خۆیەوە بە بڕگەیەکی یاسایی کە هەڵوێستی حکومەتی فیدراڵ رەتدەکاتەوە، وەرامی دایەوە. سەیرە، لە کاتێکدا ئەم

ڕووداوانەی پاش ڕاپرسییەکە ڕوویانددا، دانیشتووانانی کوێبیك گرنگیی پێدانو سەرنجی خۆیانیان لە مەسەلەی جیابوونەودوە دەگوێزایەوە بۆ بابەتگەلی دیکەی جوداواز. هیماو ئاماژە ڕوونەکانی حکومەتی فیدرال کاریگەری ئێجگار کەمیان بەسەر ڕای گشتی (کوێبیکیەکانەوە) هەبوو، هەروەك ڕاوێژو ڕێنماییەکانی دادگەی بالاو (قانوونی کلاریتی) کەمترین کاردانەوەو بایەخپێدانیان بەدوادا نەهات.

ڕاستە، (حزبی کوێبیکوا) بە سەرۆکایەتی (لوسیان بووچارد) لە دووبارە هەلبژاردنەوەی هەرێمایەتیدا بردیانەوە بەلام، لیبرالە فیدرالییەکانیش بە ڕابەرایەتی (ژان کرێتیان) سالی ١٩٩٧ هەمان سەرکەوتنیان بەدەستهێنا.

وا پێدەچوو، وەك ئەوەی کوێبیکییەکانیش بەشێوەی کەنەدییەکانی تر بڕیاری ئەوەیان دابووبێت نیوەی دووەمی سالەکانی نەوەدەکان بۆ کۆنترۆلکردنی کاروبارەکانی دارایی فیدرالیو هەرێمایەتی تەرخانبکرێت. هەردوو حکومەتە فیدرالیو هەرێمایەتییەکان بەرنامەیان دارشتبوو بەنیازی کەمکردنەوەی بودجەی دارایی، لەپێناو هەولدان بۆ نەهێشتنی کورتهێنانی بودجەکانیان (عجز الميزانيه) و کەمکردنەوەی قەردە کەلەکەبووەکانی سەریانەوە بەو ئامانجەی ولاتیشو هەرێمەکانیش بخەنە دۆخێکەوە بتوانێت بچێتە نێو بەربەرەکانێو کێبرکێی نێو دەولەتییەوە. پێوەندییە نێوحکومەتییەکانی ئەم ماوەیەی چاکسازیی دارایی زۆر لەوە

کەمتر بوون کە چاوەڕواندەکرا- بە بڕینو کەمکردنەوەی باربووەکانی فیدراڵی بۆ هەرێمەکانو بەرپرسیاریەتیکردنیان لە بەخۆگرتنی بارگرانیی پرۆگرامە بەها زۆرەکاندا.

بەڵام، لە ئێستادا بارودۆخی دارایی زۆر باشتربووەو حکومەتی فیدراڵو زۆر لە حکومەتەکانی هەرێمەکان لە وەزعی زۆر باشتردان، کەچی، هیچ ئاماژەیەك بۆ بوژاندنەوەی هەستی نەتەوەپەرستیی (نەشنالیزمی) کوبیکی لە ئارادانییە. بۆ درك کردنیش بەو سستبوونەوەی هەستی نەتەوەپەرستیی دەکرێ تەنها سەرنجی سێ رووداوی رامیاریی هەرە گرنگ بدرێت: یەکەمیان شکستەکەی هەڵبژاردنی سەرتاسەری ساڵی (٢٠٠٠)ە، کە (ژان کریتیان)و (حزبی لیبرال)ی بۆ جاری سێهەم هێنایەوە سەر دەسەڵات. ئەمەیش گرنگە کە (لیبرالیەکان) کە (کریتیان) ئەو سیاسەتمەدارەی لەلایەن زۆران لە کوبیکە فەرەنسیزمانەکانەوە رێزی کەمتری لێگیراوە، رابەرایەتییان دەکات، کورسیی زۆریان لە خودی (کوبیك)دا بەدەستهێناو، لەچاو (بلاك کوبییە) جوداخوازەکانەوە رادەیەکی بەرزتریان دەنگی جەماوەر مسۆگەرکردبوو. دەرەنجام (لوسیان بووچارد) لەسەرتای ساڵی ٢٠٠١دا وەك سەرۆکی (کوبیك) دەستلەکارکێشانەوەی خۆی راگەیاندو، یەکێکی لەم توندڕۆتر (بێرنارد لاندری)جێگەکەی گرتەوە، ئەمیش بەهیوای ئەوەبوو دووبارە بلێسەی

گیانی دەسەلاتداریەتی بگەشێنێتەوە، یان لانی کەم پێگەی (پارتی کویبیکوا) لە حوکمدا بپارێزێت.

سەرەك (لاندری) بانگەشەی بۆ هەلبژاردنێکی هەرێمایەتی کرد لە ١٤ی نیسانی (۲۰۰۳) کە بووە هۆی دووەم ڕووداوی هەرە بایەخداری سیاسی. هەلبژاردنەکەی کویبیك بەشکستخواردنی (پارتی کویبیکوا) لە دوای دوو خولی حوکمڕانیی تەواو بوو. هەروەکو بوو بەهۆی هەلبژاردنی (پارتی لیبرال) بە سەرۆکایەتی (ژان کارێست)ی فیدرالیخوازی (فیدرالیست) روو هەلمالدراو.

لیبرالیەکان لەکۆی (١٢٥) کورسیی لە (ئەنجوومەنی نیشتمانیی) (٧٦) حەفتاو شەش کورسییان بەدەستهێناو، پارتی (کویبیکوا) (٤٥) چلو پێنجو پارتی نەتەوەیی میانڕۆ بەناوی (بزاڤی دیموکراتی کویبیك) چوار کورسییەکەی کە مابووەوە. پێدەچێ دەنگدەرانی کویبیك ئامادەبووبن پرسی نەتەوەیی وەلاوە بنێننو چارەنووسی خۆیانیان رادەستی سەرکردایەتییەکی سیاسی ئەوەتۆ کردبێت کە چالاکییەکانیان بەچڕیی ئاراستە بکەن بۆ بابەتگەلی ئاساییو پەیوەست بە سیاسەتی گشتیی وەکو بەڕێوەبردنی دارایی (ئابووریی)، کاروباری تەندروستیی، پەروەردە، فەرمانڕەوایی کردنی شارەوانییو شتی تری لەو جۆرانەوە.

سێهەم ڕووداو ڕۆژی ١٢ی کانوونی یەکەمی سالی ۲۰۰۳ روویداوە، کە (ژان کریتیان)ی سەرەك وەزیرانی کەنەدا دەستی لەکارکێشایەوەو،

(پۆڵ مارتین) شوێنی گرتەوە. دوورکەوتنەوەی (کریتیان) لە شانۆی سیاسەتەوە دەستنیشانی سەرهەڵدانی نەوەیەکی نوێی سەرکردایەتی سیاسی دەکات کە بەلایانەوە چیتر نەتەوەپەرستیی کویبیک تاکە تۆخمی (رەگەز) هەرە گرنگ نییە کە جیهانبینیان رەنگرێژ بکات. پۆڵ مارتین، هەرچەن سیاسەتمەدارێکی فیدراڵییە بەڵام لە بەرامبەر بزووتنەوەی نەتەوەیی کویبیکدا لەوەی پێشتری خۆی ئاسوودەترو سۆزدارترە. هەروەك چۆن سەرەك وەزیر (ژان کارێست)ی بەرەگەز (کویبیك) لە (بێرنارد لاندری)ی پێشەخۆی زۆر زیاتر سۆزداری کەنەداو فیدرالیزمی کەنەدییە.

وەرچەرخانی بەیەکەوەی سەرکردایەتی سیاسیی لەزۆران لە هەرێمەکانی تریشدا وایکردووە بڕوا بە خەڵك بێنێت کە کەنەدا خەریکە پێوەندیە نێو حکومەتییەکان شێوەزارگەلی جوداواز لەخۆبگرن.

وەختێ بەهاتنەسەرکاری سەرەك وەزیرانێکی نوێ ئەگەری هاتنەکایەی پلەیەکی فیدرالییەتی هەرەوەزیی (هاوکاریکار) کە پێشتر نەبینراوە، دێتە ئاراوە، نابێ چاوەڕوانیی ئەوە بکرێت کە هەر شتێك شیرینیو رۆشنایی دەبەخشێت، لەگەڵ ئەمەشدا دەشێت بابەتەکانو شێوازی تاوتوێکردنیان بەتەواوی جیاوازو گۆڕاو ببێت.

سەرەڕای ئەمانەیش، وا دێتە بەرچاو کە ئاوارەییو هەستی نامۆبوونی ناوچەیی لە خۆرئاوای کەنەدادا پێویست بە بایەخپێدانو بەتەنگەوە هاتنی حکومەتی نیشتمانییو ناوەندیی کەنەدا دەکات لە ساڵانی داهاتودا.

بەهۆی دەرگە لەسەر داخستنیانو ڕێگەی هاتنەژوورەوەی نێو دەسەڵاتی نیشتمانیی لێگرتنیان لەوەتای شکستهێنانی حزبی پارێزگارە پێشکەوتووخوازەکان لە هەڵبژاردنە سەرتاسەرییەکەی ساڵی ١٩٩٣وە، خەڵکان لە هەرێمەکانی خۆرئاوای کەنەدا بە توندی نیشانگەلی ناهومێدییو بێزاربوونو نارەزایی سەبارەت بە پرۆسەی فیدراسیۆن دەردەبڕن، چونکە ئەوان وای بۆ دەچن کە بەرژەوەندییو خواستە سەرەکییەکانیان بەتەواوی پشتگوێ دەخات.

لەم لایەنەوە، گرنگیپێدانی لەمێژینەی بە کویبیکو پێگەکەی لە مێژووی کەنەدادا هەر بای ئەوەندە هاوکاربووە کە سەرجەم بیروڕاو ئارەزووێك بۆ چاکسازیی (بۆ نموونە چاکسازیی ئەنجوومەنی سینات) بە مەیلی بەرتەسککردنەوەی سنورەکانی وڵات سەبارەت بە کویبیك لێکدەدرێتەوە.

بەمەبەستی هەوڵدان بۆ دامەزراندنی (حزبێکی سیاسی کۆنەپارێزی نەتەوەیی) نوێ لە کەنەدا لە پاشماوەکانی (حزبی هاوبەندیی)و حزبی (پارێزگارە پێشکەوتنخوازە) کزبووەکانو، بۆ ئەوەی سەرکەوتوویش بێت، دەبووا دەنگدەران جێگیرەوەیەکی رامیاریی نیشتمانیان لەجیاتی (لیبرالیەکان) پێشکەش بکرابوایە، ئەوانەی لەماوەی دەیەی پێشووتردا سوودێکی زۆریان وەرگرتبوو لەوەی کە تەنها تاکە داخوازییەکی نەتەوەیی فرەوانیان هەبووە.

لەکۆتاییدا، دەرەنجام شوێن و پێگەی دانیشتووانە رەسەنەکان لە کۆمەڵگەی کەنەدیدا لەسەر مانەوەی وەك کێشەو گرفتێکی پڕئازارو چارەسەرنەکراو بەردەوام دەبێت و، کاریگەریی ئاشکرای بەسەر دیاریکردنی شێوازی پەرەئەستاندن و بەرەو پێشڤەچوونی فیدرالیزمی کەنەدیی دەبێت لە پاشەڕۆژدا.

دانوستاندن لەمەڕ داواکاریی بۆ زەوی و، مافەکانی رێککەوتنامە، شان بەشانی بڕیارەکانی دادگە باڵاکانی پەیوەست بەم بابەتانەوە، لە ئێستاوە کاریگەریان لەسەر چۆنیەتی بۆچوون و تێگەیشتنی کەنەدییەکانەوە لەبارەی سیستەمە سیاسی و دەستوورییەکەیان بەدیارکەوتووە ، هەروەکو خواستی باڵای خەڵکە رەسەنەکان بۆ حوکمی خۆکردن (خۆبەڕێوەبردن)، هەموو ئەمانە ئەگەری سەرهەڵدان و هاتنە ئاراوەی شێوازێکی سێهەمی فەرمانڕەوایەتی (حکومەت) یان لە فیدرالیزمی کەنەدییدا زیاتر کردووە.

ئەگەرچی سرووشتی ئەو شتانەی بۆ فیدراسیۆنی کەنەدیی بەڕێوەن تا ئێستێ بە تەواوی دیارو روون نییە، وەلێ، شتێکی ئاشکرایە کە (سیاسەت و فیدرالیزم) لە سەدەی تازەدا بەشێوەیەکی زۆر هەستپێکراو جوداواز دەبێت لەوەی لە رابردووی نزیکداو تا ئێستا کەنەدییەکان ناسیویانە و پێی ئاشنابوونە..

## خشتەی (١)

## هێما رامیاریی و جوگرافییەکان

## شاری پایتەخت ئۆتاوا

| | |
|---|---|
| ژمارەو جۆری یەکە پێکهێنەرەکان | (١٠) دە هەرێم (ئەلبێرتا، کۆلۆمبیای بەریتانیی، مانیتۆبا، نیوبرونززیک، نیوفاوندلەندو لابرادۆر، نۆڤاسکۆتیا، ئۆنتاریۆ، دوورگەی شازادە ئیدوارد، کوێبیک، ساسکاچوان، (٣٠) سی ناوچە: ناوچەکانی خۆرئاوا، نوناڤوت یوکۆن. |
| زمانە فەرمییەکان | ئینگلیزیی و فەرەنسی |
| رووبەر | ٩,٩٨٤,٦٧٠ کم٢ |
| رووبەر/ مەزنترین یەکەی پێکهێنەر | کوێبیک- ١,٥٤٢,٠٥٦ کم٢ |
| رووبەر/ بچووکترین یەکەی پێکهێنەر | دوورگەی شازادە ئیدوارد- ٥,٦٦٠کم٢ |
| کۆی دانیشتووانان | ٣١,٥٥٩,١٨٦ (نیسانی ٢٠٠٣) |
| ژمارەی دانیشتووانانی یەکە پێکهێنەرەکان (رێژەی سەدی بۆ کۆی گشتیی دانیشتووانان) | ئۆنتاریۆ (٣٨,٤٪)، کوێبیک (٢٣,٧٪) کۆلۆمبیای بریتانیی (١٣,٢٪)، ئەلبیرتا (٩,٩٪)، مانیتۆبا (٣,٧٪)، ساسکاچوان (٣,٢٪)، نۆڤا سکۆتیا (٣٪)، نیو برونزویک (٢,٤٪)، نیوفاوندلاندو لابرادۆر (١,٧٪)، دوورگەی شازادە ئیدوارد (٠,٤٪)، نۆرثوێست تێرنتۆریز (ناوچەکانی خۆرئاوا) (٠,١٣٪) یۆکۆن (٠,١٠٪)و نوناڤوت (٠,٠٩٪). |
| سیستمی رامیاریی- فیدراڵی | فیدراسیۆن- سیستمی پەرلەمانتاری |
| سەرۆکی دەوڵەت- فیدراڵ | شاژن ئەلیزابیسی دووەم. نوێنەری شاژن |

| | |
|---|---|
| | لەکەنەدا حاکمی گشتیی، لە نێستادا (نەدریان کلارکسۆن)ە کە شاژن لەسەر پەسەندکردنو راسپاردنی سەرەك وەزیرانەوە دایمەزراندووە. |
| سەرۆکی حکومەت- فیدراڵ | سەرەك وەزیران پۆل مارتن (٢٠٠٣/١٢/١٢) پارتی لیبرالی کەنەدا، سەرۆکی پارتەکەو زۆرینەی کورسییەکانی ئەنجومەنی نوێنەران بە دەنگدانی گەل بۆ خولێکی پێنج ساڵەی پەرلەمان کە دەکرێ نوێش بکرێتەوە، هەڵبژێردراوە. |
| پێکهاتەی حکومەت- فیدرالی | (upper House) پەرلەمانیی دوو ئەنجومەنیی ئەنجومەنی باڵا- سینات، ١٠٥ ئەندام، لەسەر بنەمایەکی هەرێمایەتیو بە ئامۆژگاریی سەرەك وەزیران لەلایەن حاکمی گشتییەوە دادەنرێن. تا تەمەنی (٧٥) ساڵی لە فەرمان دەمێننەوە.<br>lower House- House of ) commons) لقی ئەنجومەنی نوێنەرانی پەرلەمان ئەنجومەنی نوێنەران (٣٠١) ئەندام، لە پێکهاتە تاکەکاندا وەك تاك ئەندام بۆ خولێکی پێنج ساڵەیی قابیلی تازەکردنەوە، هەڵدەبژێردرێن. |
| ژمارەی نوێنەران لە لقی ئەنجومەنی نوێنەرانی پەرلەمانی حکومەتی فیدرالی خاوەن یەکەی پێکهێنەری زۆرترین دانیشتووانان | ئۆنتاریۆ- ١٠٣ نوێنەر |

| | |
|---|---|
| ژمارەی نوێنەران لە لقی ئەنجومەنی نوێنەرانی پەرلەمانی حکومەتی فیدرالی خاوەن یەکەی پێکهێنەری کەمترین دانیشتووانان | دوورگەی پرینس (شازادە) ئیدوراد (٤) تەنها چوار نوێنەر |
| دابەشبوونی نوێنەرایەتیکردن لە (Upper house)ی حکومەتی فیدرالدا | ئەنجوومەنی سینات زێتر لەسەر نوێنەرایەتیکردنی هەرێمایەتی (تا ئەوەی ناوچەیی) دامەزراوە بەم شێوەیە: ٢٤ ئەندامیان لە ناوچەکانی ماریتایم (Maritime) (نیو برونزویك، نۆڤاسکۆتیاو دوورگەی شازادە ئیدوارد)، ٢٤ یان لەکوبیبك، ٢٤یان لە (ئۆنتاریۆ)و ٢٤یشیان لە ناوچەکانی خۆرئاوا (ئەلبێرتا، کۆلۆمبیای بریتانیی، مانیتۆبا،و ساسکاچوان)، ٦ شەش کەسیان لە (نیوفاوندلاندو لابرادۆر) و (١) ئەندامێکیش لە هەریەك لە تێریتۆرییەکانەوە، دێن. |
| دابەشبوونی هێزو دەسەلاتەکان | دەستوور ٢٩ دەسەلاتی دیاریکردووە کە سەر بە حکومەتی فیدرالن‌و، ئەمانە لەخۆدەگرن: (باج‌و گومرگ، بەرگری، پاراستنی نیشتمان، بازرگانی، یاسای تاوانکاریی، هاوسەرگیریی‌و تەلاقدان، پارەو دراو، مافی سکە لێدان ( دەرکردنی پارەی وورده). مافی چاپکردن (پەرتووك‌و بەرهەمی بلاوکراوە) پێدانی مافی داهێنان (براءة لإختراع)و خزمەتگوزارییە سەرتاسەرییەکانی ولات. ناوچەکان |

| | |
|---|---|
| | دەسەڵاتی دیاریکراویان بەسەر (١٦) شانزدە بابەتدا هەیە وەکو: باجو گومرگی راستەوخۆ لەناوچەکەدا، پەروەردە، موڵکایەتیو مافە شارستانییەکان لە ناوچەکەدا، لەگەڵ بەڕێوەبردنی دادوەریی لە ناوچەکەدا. حکومەتی فیدراڵو ناوچەکان دەشێت سەبارەت بە کشتوکاڵو کۆچکردنو، هەروەها خانەنشینیو دەسکەوتی زیادە یاسای هاوبەش دەربچوێنن. |
| دەسەڵاتەکانی پتر | ئەم دەسەڵاتانە بۆ حکومەتی فیدراڵ دەگەڕێتەوە. |
| دادگەی دەستووریی (باڵاترین دادگەی پەیوەست بە بابەتە دەستوورییەکان) | دادگەی بەرزی کەنەدا لە (٩) نۆ دادوەر بە سەرۆکایەتی دادوەرێکی سەرەکیی پێکدێت بە راسپاردەو پەسەندکردنی سەرەك وەزیران لەلایەن حاکمی گشتییەوە دامەزرێنراون. |
| سیستمی سیاسیی یەکە پێکهێنەرەکان | یەك ئەنجومەنی یاسایی هەیە: ئەنجومەنی یاسادانان/ ئەنجومەنی یاسازیی ئەندامان راستەوخۆ هەڵبژێردراون بۆ خزمەتکردن لە خولێکی کە لە ٥ پێنج ساڵ زیاتر نەبێتو قابیلی تازەکردنەوەیە. |
| سەرۆکی حکومەت- یەکە پێکهێنەرەکان | سەرۆکی دەوڵەت، نوێنەری شاژن وەك جێگری حاکمی گشتیی ناماژەی پێدەکرێت، لەسەر راسپاردەو راوێژی سەرەك وەزیرانەوە حاکمی گشتیی دایدەمەزرێنێت.<br>سەرۆکی حکومەت، سەرەك وەزیر، |

|  |  |
| --- | --- |
|  | سەرکردەی ئەو حزبەی زۆرینەی کورسییەکانی ئەنجومەنی یاسادانانی هەبێت، بۆ خولێکی زورتر نەبێ لە ٥ پێنج ساڵ‌و قابیلی نوێکردنەوە بێت، لە پۆستەکەیدا دەمێنێتەوە. |

خشتەی (٢)

هێماو ئاماژە ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکان

| GDP کۆی داهاتی گشتیی ساڵانە | ٩٤٠,١ بیلیۆن دۆلاری ئەمریکی (٢٠٠٢) |
|---|---|
| پشکی تاك لە داهات | ٢٩,٩٠٠ دۆلاری ئەمریکی (٢٠٠٢) |
| قەرزی نیشتمانیی (دەرەوە) | ١,٩ بیلیۆن دۆلاری ئەمریکی |
| Sub- national debt قەرزی لاوەکی (ناراستەوخۆ) نیشتمانیی | ١٥٨,٩ بیلیۆن دۆلاری ئەمریکی |
| رێژەی بێکاریی نیشتمانیی | ٧,٤٪ (کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣) |
| یەکەی پێکهێنەر خاوەن بەرزترین رێژەی بێکاریی | نیوفاوندلاندو لابرادۆر- ١٦,٧٪ |
| یەکەی پێکهێنەر خاوەن نزمترین رێژەی بێکاریی | مانیتۆبا ٥٪ |
| رێژەی خوێندەواری هەرزەکاران | ٩٩٪ |
| خەرجیی نەتەوەیی لەسەر پەروەردە وەك رێژەی سەدی | ٥,٥٪ لەکۆی گشتی بودجە |
| هیوای ژیان بەساڵ | ٧٩,٢ |
| داهاتی حکومەتی فیدراڵ لە | ١٣٨ بیلیۆن دۆلاری ئەمریکی |

| | |
|---|---|
| گومرگو سەرچاوەگەلی هاوپێوەند | (٢٠٠٣) |
| داهاتی (٤)یەکە پێکهێنەرەکان لە گومرگو سەرچاوە هاوشێوەکان | ١٧٦,٧ بیلیۆن دۆلاری ئەمریکی (٢٠٠٣) |
| یارمەتییەکانی فیدراڵ بۆ یەکە پێکهاتەکان | ٣٧ بیلیۆن دۆلاری ئەمریکی (٢٠٠٣) |
| میکانیزمەکانی هاوسەنگی (یەکسانی) کردن | سێ میکانیزمەی سەرەکیی بۆ هاوسەنگیو یەکسانی کردنی ئاسۆیی لەنێوان ناوچەکاندا هەنە: بەرنامەی تەندروستییو یارمەتیدانی کۆمەڵایەتی (سۆشیال)ی کەنەدی، هاوکاریی لەسەر بنەمای ستاندەردی پێنج ناوچەیی هەروەها دەزگیرۆیی ناوچەیی. |

# سـويسـرا

## كۆنفیدرالیەتی سویسری

نووسینی/ تۆماس ستاوفەرو نیکۆل تۆپەرڤیان

### ١- دیرۆكو پەرە نەستاندنی فیدرالیزم

سویسرا ولاتێکی (٧,٢) ملیۆن کەسییە لە نێوەڕاستی ئەوروپادا. دراوسێکانی بریتین لە ئەلمانیا، نەمسا، لیختنشاین، ئیتالیاو فەرەنسا. لەسالی (١٨٤٨)ەوە بووەتە فیدرالیی و، دەزگە فیدرالییەکانی سەلماندوویانە کە ولات توانیویە لە رووی سیاسییەوە شێوەگەلی هەمەجۆرو جوداواز رابێنێت. بەدرێژایی مێژوو هەر (٢٦) کانتۆنو نزیکەی (٣٠٠٠) سێ هەزار کۆمیونەکانی توانیویانە دابونەریتو کەلتووری خۆیان ئاوەها گەشە پێ بدەن کە سویسرا، لەرابردووو لەئێستەیشدا بەگوێرەی هەریمو کانتۆنو کۆمیونەکانی خاوەنی فەرهەنگو کەلتووری فرەیی بووەو هەر وایش ماوەتەوە. سویسرا وەکو ولات هەولێنەداوە سەرجەم دانیشتووانەکانی بکاتە یەك، هەروەکو هەولی ئەوەشی نەداوە بەپێی هێلی زمانەوانییو ئایینیو فەرهەنگەکانەوە جوداوازییان لەنێواندا بکات، ئەگەرچی هەندێ لە کانتۆنەکانی ئەمەیان کردووە. خالی دەسپێکی فەرمیی مێژووی سویسرا بۆ سالی (١٢٩١)

دەگەڕێتەوە. لەو ساڵەدا سێ کانتۆن (ئێستێ بە (Ortc) ناودەبرێن) رێککەوتننامەیەکیان ئیمزاکردو یەکەیەکی بەرگرییان دامەزراند، پابەند بە سیستەمێکی ناوبژیوانیکردن لەکاتی پەیدابوونی ناکۆکی لەنێوان کانتۆنەکاندا. یەکێتییەکە بەو مەبەستەبوو رێ بە دەستدرێژیی دەرەکی نەدات‌و هاوسەنگیی هێز لەنێوان کانتۆنە ئەندامەکانیدا دەستەبەر بکات. ئەوجا چەند کانتۆنی دیکەش بە بەستنی رێککەوتننامەی دواتر هاتنە نێو یەکێتییەکەوەو، بوو بەهۆی پەرەسەندنی فیدراسیۆنێك کە لەسەر بنەمای سیستەمێکی رێککەوتندا دامەزرێنرابوو. کۆنفیدراسیۆنەکە دەبوا ئەوەندی پێویستی دەکرد هاوکاریی‌و یارمەتی بۆ داکۆکی‌و بەرگریکردن لە سەروەریی سویسرا دابین بکات، شان بەشانی پاراستن‌و چەسپاندنی دەسەلآت‌و سەربەخۆیی کانتۆنەکانیشی.

لەکۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا نوێکردنەوە لەوڵاتانی دراوسێدا لەژێر کاریگەریی بیروباوەڕەکانی شۆڕشی فەرەنسییدا داواکاریی گەرمو بەپەلەی بۆ هەندێ مەرکەزییەت‌و تازەگەریی لە سویسرادا هێنایە ناراوە. ساڵی ١٧٩٨ هێزەکانی فەرەنسا بەسەرکردایەتی (ناپلیۆن) سویسرای داگیرکردو دەوڵەتێکی (مەرکەزی) لەشێوەی ئەوەی فەرەنسادا دامەزراند. کانتۆنەکان بۆ یەکەگەلی بەڕێوەبردنی یەکسان گۆڕدران وەلێ، سویسرا سەلماندی کە وەکو دەوڵەتێکی ناوەندیی ناشێ بەرێت بەڕێوەو، ناپلیۆن سیستەمی کانتۆنیی بۆ گێڕایەوەو سیستەمێکی فیدراڵیی لە سویسرادا خستەڕوو.

ئەمەو، دوای تێکشکانی ناپلیۆن سویسرییەکان دووبارە دەنگیان بۆ کۆنفیدراسیۆنێکی شلۆقو خاو دایەوە ئەوەبوو لە کۆنگرەی ڤییەنادا. ساڵی ۱۸۱۵ سنوورەکانی سویسرا دیاریکرانو بێ لایەنیی ولاتیش بڕیاری لێدرا.

کاتێك زۆر لە کانتۆنە (پرۆتستانتەکان) حکومەتگەلی کۆماریی پێشکەوتنخوازیان پەسەندکرد، لە کانتۆنەکانی دیکەدا، کە (کاسۆلیکەکان) تیایاندا باڵادەست بوون، خانەوادە دەوڵەمەندو دەسەڵاتدارە دێرینەکان دامودەزگەی دەسەڵاتی کۆنەپارێزیان دامەزراندەوە. کانتۆنە پێشکەوتنخوازەکان هەوڵیان بۆ دیموکراتیزەکردنو بەرەو مەرکەزییەت بردنی یەکێتییەکە دەدا. جا، کانتۆنە کۆنەپارێزەکان (بەزۆری کاسۆلیك)، بە مەبەستی سنووردارکردنی هەژموونی کانتۆنە پێشکەوتخوازەکان (بەزۆری پرۆتسیتانەکان) یەکێتییەکی نهێنییان دامەزراند (Sanderbund) ئەم کارە ڕێککەوتنەکەی فیدراسیۆنی هەژاند. وەختێ یەکێتییەکە ئاشکراکراو کانتۆنە کاسۆلیکەکان رازی نەبوون هەڵیوەشێننەوە، کانتۆنە پرۆتستانتەکان بە زەبری هێز هەڵیانوەشاندەوە.

ساڵی (۱۸٤۷) وەك ساڵی (شەڕی ناوخۆیی) چووە ناو مێژووی سویسراوە، ئەو شەڕەی بە تێکشکاندنی کانتۆنە کاسۆلیکەکان کۆتایی هات.

ساڵی ١٨٤٨ دانیشتووان و کانتۆنەکانی سویسرا دەستوورێکی فیدڕالییان پەسەندکرد. ئەم دەستوورە سازشکردنێکی کردەنی (پڕاگماکی) گونجاو بوو لەنێوان براوەکان و دۆڕاوەکانی شەڕی ناوخۆییدا. ئەوەبوو جۆرێك لە مەرکەزییەتی داهێناو، لەهەمان کاتدا لەڕێگەی دەستوورو سنووردارکردنی دەسەڵاتەکانی حکومەتی ناوەندەوە ڕێزگرتنی بۆ هەمەچەشنیی و جوداوازیی کانتۆنەکان دابینکرد. نیشانەیەکی پڕاگماتیزمیی دەستوورەکە ناوە فەرمییەکەی سویسرایە کەهەر وەکو شێوە لاتینییەکەی (confoederatio Helvetica) -CH- هێڵرایەوە بۆ ئەوەی هیچ کێشەکێشێك لەسەر ناوەکەوە دروست نەکات. ئەنجامی ئەمەیش ئەوەبوو کە وڵاتی (سویسرا) زۆرجاران پێییدەگوترێت (کۆنفیدراسیۆن) هەرچەند خۆی لە ڕاستییدا (فیدراسیۆن)یشە.

سویسرا بە دەستووری ساڵی ١٨٤٨ هەنگاوێکی مەزن و گرنگی بەرەو مۆدێرنیتە هاویشت و بووە وڵاتێکی فیدراڵیی خاوەن حوکمی هاوبەش و (فەرمانڕەوایی خۆبەڕێوەبردن کە لەسەر بنەمای دەستوور چەسپێنراوە).

تازەگەریی لەوڵات بۆ ئەوە نەبوو دانیشتووانانی بکاتە یەك چەشن (یەك ڕەنگ)، بەڵکو هەوڵیداوە نەتەوەیەکی سویسری دروست بکات بە هێلانەوەی جوداوازیی و هەمەڕەنگییەکەی ئەوەی کە پێشتر لە ئارادابووە.

تێکەڵاوکردنی فەرمانڕەوایی هاوبەش‌و خۆبەڕێوەبردن بووە هۆکاری ئەوەی وڵاتەکە لە جوداوازیی‌و هەمەڕەنگییەوە یەکێتییەك دروستبکات. هەرچەندە لەم چەند ساڵانەدا دەستووریش‌و پرۆسەی سیاسیی زێتر بەرەو پێشەوە چوونەو پەرەیان ئەستاندووەو، دوو پێداچوونەوەی گشتی بۆ دەستوورەکە (١٨٧٤، ١٩٩٩) ئەنجامدراون، لەگەڵ ئەمەشەوە دیزاینە گشتییەکە هەروەك خۆی ماوەتەوە. دەستووری فیدراڵی نەخشەو بناخەی گونجاوی بۆ بەناشتیی‌و پێکەوە ژیانی گروپهای فەرهەنگیی، زمانەوانیی‌و ئاینی جیاواز فەراهەمکردووە.

## ٢- ماددەو مەرجە دەستوورییەکانی پەیوەست بە فیدرالیزم

سویسرا فیدراسیۆنێکە لە (٢٦) کانتۆن پێکهاتووە (ماددەی ١)، کەوا شەشیان بە (نیوە کانتۆن) ناو دەبرێن کە لەدابەشبوونی دێرینەی سێ کانتۆنانەوە پەیدابوونە، ئەو دابەشبوونەی بەر لە دروستبوونی فیدراسیۆنەکەوە ساڵی (١٨٤٨) روویدابوو. نیو کانتۆنەکان هەمیشە هەمان پێگەی بیست کانتۆنەکانی دیکەیان هەیە (ماددەی ٣)، وەلێ، لەحاڵەتی پەیوەست بە ئامرازەکانی حوکمڕانیی هاوبەش تەنها نیوەی ژمارەی نوێنەرانیان هەنە، کە ئەوە دەگەیەنێت ئەوان لە (ئەنجوومەنی ویلایەتەکان) دا لەجیاتی دوو نوێنەر تەنیا یەکێکیان دەبێت (ماددەی ١٥٠)، هەروەها نێو دەنگی کانتۆنیان هەیە ئەگەر زۆرینەی کانتۆنەکانی پێویست کرد بۆ راپرسییەك لەسەر ئاستی فیدراڵیدا ٠ماددەی ١٤٢).

بەگوێرەی دەستووری فیدراڵیی سویسرای ساڵی ١٩٩٩و، هەروەها دەستوورەکانی پێشووتریش، کانتۆنەکان سەروەریی خۆیانیان هەیە تا ئەو جێگەیەی سەروەرییەکەیان بەپێی دەستوور سنووردار کرابێت (ماددەی ٣). سەروەریی لەم حاڵەتەدا واتای ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوان مافی خۆبەڕێوەبردنیان هەیە لەنێو سنوورەکانی کانتۆنەکانیانداو حکومەتی ناوەند لەسەری پێویستە ڕێز لە سەروەریی کانتۆنەکان بگرێت. لەگەڵ ئەمەشەوە ئەم سەروەرییە ڕەها نییە. دەستوور بە زۆران ڕێگاو شێوازی جوداواز سەروەریی کانتۆنەکانی سنووردار کردووە. بۆ نموونە، دەستوور مافە بنەڕەتییەکانی بۆ سەرجەم دانیشتوانانی سویسرا دابین کردووە (ماددەکانی ٧- ٣٦)و، چاوپێداخشاندنەوەی دەستووریی لەلایەن (دادگەی فیدراڵیی سویسرا)وە داناوە کە چاودێریی بەسەر پاراستنی ئەو مافە ریشەییانە لەلایەن دەسەڵاتو بەرپرسانی کانتۆنەکانەوە دەکات. ڕوونتر، سنووردارکردنی سەروەریی‌و دەسەڵاتەکانی کانتۆنەکان لە دەسەڵاتەکانی یاسادانان‌و کارگێڕیی حکومەتی ناوەندەوە سەرچاوە دەگرێ.

دابەشبوونی دەسەلات لەنێوان کۆنفیدراسیۆن (حکومەتی ناوەند)و کانتۆنەکاندا بەپێی سیستمی هێزە دیاریکراوەکانی فیدراڵیدا ڕێکخراوە.

دەسەڵاتەکانی فیدراڵی (نێوەند) پێویستە لە دەستووری فیدراڵیدا باسکرابن. هیچ بۆشاییەك- کەلەبەر- لەنێوان قەڵەمڕەوی سەروەریی نێوەند)و هی کانتۆنەکاندا نییە. هەر مەسەلەیەکی تازەبابەت کە لە

دەستووردا باسی نەکرابێت بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەکەوێتە بازنەی دەسەڵاتەکانی کانتۆنەکانەوە(ماددەی ٣).

بەم شێوەیە، ئەگەر بە تیۆریی بدوێین، ئەوا هەرگیز درز یان بۆشایی لە دابەشبوونی دەسەلاتەکاندا بەرچاو ناکەوێت. تێبینییەکی تر پەیوەستە بە هێز بۆ دابەشکردنی دەسەڵاتەکان. مادامەکی پێداچوونەوە بە دەستوور مەسەلەیەکی فیدراڵییە (ماددەکانی ١٩٢- ١٩٥)و، دابەشبوونی دەسەلاتەکانیش تەنها لە دەستوورەوە سەرچاوە دەگرێت، بۆیەکا پێداچوونەوە بە هێزەکان دەسەڵاتی حکومەتی فیدراڵە (نێوەند) هەرچۆنی بووە، ئەم هێزە بەمافێکی کانتۆنی لە حوکمڕانیی هاوبەشدا دیاریدەکرێت.

لەوەتای پێداچوونەوەی ساڵی (١٩٩٩)ی دەستوور بە رونی ئەوەی سەپاندووە کە کۆنفیدراسیۆن (نێوەند) تەنها ئەو ئەرکانە بەجێ دەگەیەنێت کە پێویستیان بە گونجانو ڕێکخستنی هاوشێوەو گشتیی هەیە (ماددەی (٢) (٤٢)).

بەپێی ئەم قانوونەوە ناوەند لە دابەشبوونی هێزو دەسەڵاتەکان لە نێوان خۆیی‌و حکومەتەکانی کانتۆنەکاندا پشکی پاشکۆیی بوونی بەردەکوێت، بەو مانایەی نێوەند تەنها ئەو دەمە دەسەڵاتی دەبێت کە ڕێکخستنێکی هاوشێوەو گشتیی پێویست بکات.

ئەگەرچی بە پێداچوونەوە بەدەستووری فیدراڵیدا هەندێ چالاکیی نوێ بۆ فیدراڵ تەرخانکراوە، وەلێ ژمارەیەکی بەرچاو لەبابەتەکان لەنێو

بازنەی دەسەڵاتەکانی کانتۆنەکانـدا ماونەتـەوە. لیـستی خـوارەوە چـەند نموونەیەك دەخاتەڕوو کە بـۆ فەرمانڕەوایـەتی خۆبـەڕێوەبردنی کانتۆنـەکان گرنگو مایەی بایەخپێدانن:-

١. دەستووری دەوڵەتی: دەرچـوواندنی دەسـتوورە دەوڵەتییـەکان ئـەرکی کانتۆنەکانە. ئـەوان رژێـمو سیـستمی تایبـەتی خۆیـان دەستنیـشان دەکەن.

٢. شـــارەوانییەکان: هـــەر کانتۆنـــەی هێـــزی جـــوداواز دەبەخـــشێتە شارەوانییەکان بەڵام، هەر وەختی ئەو هێزانە خرانە نێو دەقی قانونەوە ئـەو دەمـە لەلایـەن (دادگـای فیـدرالیی سویـسرا)وە گـەرەنتییان پێدەردێتو بەهەمان ئەو ڕێگەیە دەپارێزرێن کە مافە بنەڕەتییـەکانی تاکەکانی پێ دەپارێزرێت.

٣. پەروەردە: پەروەردە هەر لەکۆنەوە بابـەتێکی سـەر بـە کانتۆنەکانـە. کانتۆنـەکان تـا ڕاددەیـەکی زۆر (پرۆگرامـەکان) دادەنـێنو دەسـتەی مامۆستایان (میلاك)و تاد... دادەمەزرێنن یان، هەڵیاندەبژێرن.

٤. باری گشتیی: لە سەردەمی ئاشتیو ئارامییـدا، بـاری گـشتیی هـەر بەپێی دابونەریتیی کۆن بابەتێکی سەر بە کانتۆنەکان بووە.

٥. رۆشنبیریی: لە هەندێ بوارانـدا نـەبێت پـشتگیریی کردنـی چـالاکییە فەرهەنگییەکانو پاراستنی کەلوپەلە کەلتوورییەکانی بـە کانتۆنـەکان نەسپاردراون.

٦. ژێرخان: کردنەوەو دروستکردنی جادەو شەقامو دەستەبەرکردنو پێدانی ئاوو کارەبا بە زۆریی بە ئەستۆی کانتۆنەکانەوەن.

٧. باجی راستەوخۆ: کانتۆنەکان باجەکانی کە سەر بەخۆیانن بەرز دەکەنەوەو رێژەی باجو گومرگ دیاریدەکەن، لەگەڵ جۆرو بابەتی ئەو شتانەی بۆ داهاتەکانی گومرگ دەگەڕێنەوە. پرەنسیپی هاوکاریکردن دانانی قانوونیش دەگرێتەوە.

حکومەتی (ناوەند) خۆی، زۆر قانوونەکانی فیدراڵ کە لە سنووری دەسەلاتە دەستوورییەکانی خۆیدانە، پیادەیان ناکات. ئەوە کانتۆنەکانن کە لە کارپێکردنی قانوونە فیدرالّییەکان بەرپرسیارن. ئەمەش دەرفەتی باش بۆ ئایینداریی‌و بایەخدان بە خەسڵەتە تایبەتییەکانیان بۆ کانتۆنەکان فەراهەم دەکات. هەر بەگوێرەی پرەنسیپی هاوکاریکردنەوە، حکومەتی فیدرال (نێوەند) پێوستە جێبەجێکردنی قانونی خۆی بۆ کانتۆنەکان جێ بهێڵێت، تا ئەو جێیەی کە مومکینەو، تەنها ئەو مەسەلانە یەکلایی بکاتەوە کە یەکبوونییان دەیخوازێت. ژمارەیەك دامەزراوەو، ئەزموونو تاقیکردنەوە کاریگەریی گرنگ لەرووی وەرگرتنی بڕیارگەل لەسەر ئاستی فیدرالّدا دەخەنە سەر کانتۆنەکانەوە.

**یەکەم:** دەسەڵاتدارانی یاسادانانی فیدرال پێویستە لەسەریان راستەوخۆ ئاگاداری کانتۆنەکان بکەنەوە لەبارەی نیازەکانیانو، لەزۆربەی حالّەتەکاندا قانون ئەو مافە بە کانتۆنەکان دەبەخشێت کە دەبێ پرسیاریان

پێ بکرێت. بەم شێوەیە کانتۆنەکان کاریگەرییان بەسەر پرۆسەکەوە هەیە تەنانەت بەر لەوەیش پێشنیازێك بگاتە پەرلەمانی فیدراڵیش (ماددەکانی ٤٥، ٥٥). ئەمە گرنگە چونکە لەم قۆناغەدا کانتۆنەکان هێشتا کاریگەریی دیاریان بەسەر پێکهێنانی ئەنجوومەنی یاسادانەوە هەیە، کەچی، دوواتر کاریگەرییەکەیان لە تەنیا گوتنی (بەڵێ، یان نەء)دا دەمێنێتەوە.

**دووەم:** پەرلەمانی فیدراڵ (ئەنجومەنی فیدرال) بۆ دوو ئەنجومەن دابەشکراوە، (ئەنجومەنی نیشتمانیی) کە نوێنەرایەتی خەڵك دەکات، لەگەڵ (ئەنجومەنی ویلایەتەکان) کە نوێنەرایەتی کانتۆنەکان دەکاتو تیایدا هەر کانتۆنێك ژمارەی دەنگی یەکسانیان هەیە. هەر ئەنجومەنەیش بە تەواویی هەمان هێزو دەسەلاتیان پێدراوەو، هیچ قانوونێکی فیدراڵی ناکرێت بەبێ ڕەزامەندیی هەردوو ئەنجومەنەکان کاری پێ بکرێت، ماددەکانی (١٤٨، ١٥٦، ١٦٣).

کاریگەریی کانتۆنەکان لەنێو ئەنجومەنی ویلایەتەکاندا سنووردارە، سەبارەت بەو فاکتەرەوە کە کانتۆنەکان بۆیان نییە ڕێنمایی قانونیی مولزیم بە نوێنەرکانیان بدەن (ماددەی ١٦١). بەهەرحاڵ، کانتۆنەکان کاریگەریی ناراستەوخۆ بەڵام گرنگیان بەسەر ئەندامانی (ئەنجومەنی نیشتمانیی)یدا هەیە، ئەمەیش بەهۆی سیستمی هەڵبژاردنەوەیە. تاکە کاریگەریی دەرەکیی بەسەر (ئەندامانی پەرلەمان)ەوە برێتییە لە

پێویستبوونیان بە دووبارە هەڵبژاردنەوەیان. لە هەڵبژاردنەکاندا بۆ (ئەنجومەنی نیشتمانی) کانتۆنەکان یەکەکان پێکدەهێنن (ماددەی ١٤٩) هەروەکو لقی حزبەکان لەو کانتۆنانەدا کاندیدەکان (پاڵێوراوان) دیاریدەکەن.

لە سویسرا، حزبە سیاسییەکان لەسەر ئاستی کانتۆنەکاندا ئێجگار بەهێزن، بۆیەکا نوێنەرانی هەردوو ئەنجومەن هەردەم لە هەوڵی ئەوەدا دەبن چالاکییە سیاسییەکانیان بگونجێنن لەگەڵ قازانجو بەرژەوەندییەکانی لقو کۆمیتەکانی ئەو حزبانەی کە لایەنگیریانن لە کانتۆنەکاندا.

ئەم ڕەوشە بە بەراورد قورساییەکی زۆر دیار دەبەخشێتە ئەو هێزانەی خوازیاری مەرکەزییەتن لەوڵاتدا.

**سێهەم:** چاکسازییو هەموارکردنی قانوونەکانو دەستوور هەمیشە دەخرێتە راپرسیی (ریفراندۆم) گشتییەوە (ماددەکانی ١٤٠، ١٤٢) لەم رووەوە پێویستە رەچاوی جوداوازیی دوو جۆر ریفراندۆم بکرێت. بۆ یاساسازیی ئاسایی قانونێکی فیدرالی بۆ وێنە، راپرسییەکە ئیختیارییەو، تەنها ئەو کاتە پێویستە بکرێت کە (٥٠,٠٠٠) پەنجا هەزار هاوەڵاتی، یاخود هەشت کانتۆن داوایان کردبێت. پێشنیازێك ئەو کاتە پەسەند دەکرێت کە زۆرینەی دەنگدەرانی وڵات بەگشتیی لەسەری کۆكو رازیی دەبن. سەبارەت بە بڕیارە گرنگەکان وەك پێداچوونەی دەستوورو چوونە نێو رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانەوە بە مەبەستی ئاسایشی گشتییو هاوبەش،

یاخود رێکخراوگـەلی خـاوەن هێـزی دەرەکیـی (لـە سـەرووی دەسـەڵاتی نیشتمانەوە)- ئـەوا ریفرانـدۆم (ئیجبـاریی) دەبێـتو هـیچ پێویـست بـە کۆکردنەوەی ئیمزا ناکات.

لـەم حاڵەتـەدا زۆرینەیـەکی دوولایەنـە پێویـست دەبێـت، ئـەوەیش برێتییـە لـە پەسـەندکردنی زۆربـەی کانتۆنـەکان وێـڕای زۆرینـەی دەنگدەرانیـشەوە. ئەمـەیش ئـەوە دەگەیـەنێت کـە پێویـستە زۆرینـەی دەنگدەران لەسەرتاسـەری سویـسرادا، هـەروەها زۆرینـەی دەنگـدەرانیش لەزێتر لە نیوەی کانتۆنەکاندا، پەسەندی بکەن. بەرەچاوکردنی جـوداوازیی بەرچاو لەرووی دانیشتووانانەوە لەنێوان کانتۆنە گەورەو بچووکەکاندا، هەر پێشنیازێك بـۆ هـەمووارکردنی دەسـتوور لـەرووی تیۆرییـەوە بـۆی هەیـە رەتبکرێتەوە هەرچەندە بە نزیکەی (۹۰٪) لەسـەدا نـەوەدی دانیـشتوانان پەسەندیان کردبێت، ئەگەر رەتکردنەوەی ئەو لەسەدا دەیە بە یەکسانیی لە کانتۆنە هەرە بچووکەکاندا بەشداریی تیادا کرابێت. بە وتەیەکی تـر، ئـەو دەمەی پێویست بە پەسەندکردنی زۆرینەیـەکی کانتۆنـەکان بکـات، ئـەوا دەنگدەرێکی سەر بە بچووکترین کانتۆنی تەواو (یووری Uri) بەرامبەر بـە (۳۵) سیی‌و پێنج دەنگدەرانی دانیشتووی کانتۆنی زیۆریخ دەوەستێت.

بێجگە لە دەزگـە رەسمییـەکانی حـوکمڕانیی هاوبـەش، کانتۆنـەکان ئامرازی دیکەیان لەبەردەستدایە کـە بـە هۆیانـەوە کاریگـەرییان بەسـەر

سیاسەتی فیدراڵەوە دەبێت. گرنگترین فاکتەریشیان لە خودی سیستەمی دیموکارسیدایە کە هەموان لەسەری کۆکن.

ئەمەیش لە بنەڕەتدا وا دەگەیەنێت کە هەر بڕیارێکی سیاسیی گرنگ هەمیشە بە ڕێککەوتن و ڕەزامەندیی و ڕای سەرجەم حزب و گروپ و کانتۆن و ئایینە گرنگەکان وەردەگیرێت. بناغەی ئەم شێوازەی سیاسەتکردن لە دامودەزگاکانی دیموکراسیی ڕاستەوخۆو، بەتایبەتی لە ڕاپرسیی گشتییەوە سەرچاوەی گرتووە. سیاسەتێکی نێوەند ئەگەر گروپێکی ڕێکخراوی خاوەن دەسەڵات ڕەزامەندیی لەسەر نەبێ تەقریبەن موستەحیلە جێبەجێبکرێت، چونکە بەرهەلستکارێکی بەهێز بۆی هەیە زۆر بە سانایی بە ڕێگەگەلی دیموکراتیی ڕاستەوخۆ پەکی بخات و بیوەستێنێ.

لایەنی جێبەجێکار لە حکومەتی فیدراڵ، ئەنجوومەنی فیدراڵ ·ماددەکانی ١٧٤- ١٧٩) نموونەیەکی چاك لە دیموکراسیی پەسەندکراوی هەموو لایەك دەخاتەڕوو. ئەو ئەنجومەنە لە (٧) حەوت ڕاوێژکاری فیدراڵ پێکهاتووە، کە لەلایەن هەردووك ئەنجومەنەکانی پەرلەمانی فیدراڵەوە هەڵبژێردراون و، هەر یەکێکیان سەرۆکی وەزراەتێکەو هەموویان بەیەکەوە دەسەڵاتی جێبەجێکردنی فیدراڵ پێکدەهێنن. بۆ بڕیارەکانی حکومەت سەرجەم ئەندامانی (ئەنجومەنی فیدراڵ) دەنگی یەکسانیان هەیە ئەمەیش وایکردووە کە بۆ سەرۆکی فیدراڵ تەنها ئەوەیان هەڵبژێردرێت کە لە هەموویان توانا و کارامەترە لەنێوانیاندا. وەك دەرەنجامێکی ئەو

دیموکراسییەشیان هەتا بکرێت سەرجەم گرووپە گەورەو سەرەکییەکان نوێنەریان لەنێو (ئەنجومەنەکە)دا دراوەتێ، کە مانای ئەوەیە حزبە سیاسیە گرنگەکانو، هەروەها گرووپە زمانەوانییەکان، کانتۆنەکانو، هەردوو توخم- نێرو مێ- نوێنەری خۆیانیان لەوێدا هەنە. ئەم نوێنەراتیکردنە دەرەنجامی ماددەیەکی قانونیی نییە، هەروەك لە دەستووری فیدرالیشدا باسی نەکراوە.

بەهەرحاڵ لەوانەیە پەرلەمانتارێکی ئەڵمانییزمان لە حزبی (رادیکاڵ) دەنگی بداتە کاندیدکراوێکی فەرەنسیزمانی حزبی سۆشیال دیموکرات ئەو کاتەی نۆرەی ئەوەی دواییان بێ شوێنی یەکێ لە نوێنەرەکانی ئەنجومەنەکە بگرێتەوە. پێوەندیی ئەمەیش بە سیستمی دیموکراتییەکەوە ئەوەیە کە پرۆژە یاسایەك لەلایەن دەسەڵاتی جێبەجێکاری فیدراڵەوە دەرچوێنرابێت، دەرفەتی ئێجگار کەمی دەبێت کە لەلایەن خەڵکەوە قەبووڵ بکرێت ئەگەر هاتو یەك گرووپی سەرەکیی (یان زێتر)- بۆ وێنە، حزبێك یان چەند کانتۆنێك پشتگیریی لێوە نەکەن. مادامەکی بەرهەڵستێکی بەهێز بتوانێ زۆربەی چالاکییەکانی (ئەنجومەنی یاسادانان) بوەستێنێت، ئەوا لە بەرژەوەندیی هەر حزبێك دادەبێت کە گرووپەکانی دیکەیش رۆڵیان لە گشت پرۆژەو پێشنیازە گرنگەکاندا هەبێت.

بەم شێوەیەش، لە دەسەڵاتی جێبەجێکاری فیدراڵییدا نوێنەریان ببێت.

کاروباری دادگەریی تا رادەدیەکی زۆر لە دەستی کانتۆنەکاندایە، (تەنها چەند بابەتێك نەبێت) هەموو کارێکی یاسایی سەرەتا لە دادگەیەکی کانتۆنییەوە دەست پێدەکات بەبێ گوێدان بەوەی کە سەر بە یاسای کانتۆنی یان فیدرالییەوەیەو، زۆربەی بڕیارەکانیش لە کانتۆنەکانەوە دەدرێن. (دادگەی فیدراڵ) تاکە دەسەلاتی دادوەریی فیدراڵییە. گرنگترین ئەرکەکانی (دادگەی فیدرال) ئەوەیە کە بە بڕیارەکانی دادگە هەرە بالاکانی کانتۆنەکاندا بچێتەوە لەمەڕ داواکانو، ڕۆڵی دادگەیەکی دەستووریی بگێڕێت. بەلام، تەنها بۆ هەندێ بابەتی تایبەت نەبێ کە (دادگەی فیدراڵ) یەکەم دادگەو تەنها دادگەیە. وێڕای ئەمەیش، بە گوێرەی فیدرالییەتی سویسراوە، (دادگەی فیدراڵ) ناتوانێ کۆنترۆلی پابەندبوونی بەرپرسانی کۆنفیدراسیۆنەکە بە دابەشبوونی دەسەلاتە دەستوورییەکانەوە بکات، وەك لە فیدراسیۆنەکانی تردا هەیە.

(دادگەی فیدرال) بالاترین دەسەلاتی دادوەریی فیدرالییە (ماددەی ١٨٨)، وەلێ بە ئەنجوومەنی یاسادانانی فیدراڵەوە پابەندکراوە. ئەوەیش بەشێوەیەکی دیموکراسییانە لەرێگەی راپرسییەکی گشتییەوە رەوایەتی پێدەدرێت. لێکدانەوەیەکی ئاسایی بۆ ئەم خەسلەتە بێ وێنەیە بۆ بێ متمانەیی لەمێژینەی دانیشتوانان لەهەمبەر هێزو توانستی دادوەرانو، هەروەها بڕوابوونێکی پتەویان بە پرۆسەی دیموکارسی، دەگەڕێتەوە. تەنها ئەو کاتەیش لەمە تێدەگەن ئەگەر زانیمان هەموو قانوونێکی فیدرالیی

بناغەی لەسەر لێکتێگەیشتنێکی روونو دیار لەنێوان سەرجەم هێزە سیاسییە سەرەکییەکاندا داکوتراوە. ئەمەیش وای لە نووسەرانی دەستوورەکە کرد بڕیار بدەن کە دادوەران بۆیان نییەو نابێت ئەوەی بە رێگەی دیموکراسیی بڕیاری لێدراوە ئەوان بیانسڕنەوە. بە کردەنیش، ئەو متمانەیە بە دەزگە دیموکراتییەکان دراوە بەزۆریی لەجێی خۆیدا بووە، تەنها لەچەند حاڵەتێکی نائاساییدا نەبێت، دەستەی یاسادانەران گوێڕایەڵی ئەو قانوونانە بوونە کە پێیانەوە پابەندن. سیستەمێك کە فیدراڵی بێ‌و لەسەر ریفراندۆم بنیاتنراو بێت- بەتایبەتی پێویستبوونی پەسەندکردنی زۆرینەی کانتۆنەکان لە بڕیارە گرنگەکان- هەندێك جاران رەخنەی ئەوەیان لێدەگیرێت کە پرۆسەی سیاسیی لە وڵاتی سویسرادا خاودەکەنەوە.

بەتایبەتی سیاسەتمەدارە پێشکەوتنخوازەکان کێشە سەرەکیی‌و گشتییەکان دەبینن، چونکە زۆربەی کانتۆنە بچووکەکان لەکاتی دەنگدانا رەفتاریان کۆنەپارێزانەیەو، دەتوانن بەهۆی هێزیانەوە لە راپرسییەکانداو، هەروەها بە بوونیان لە (ئەنجومەنی دەوڵەت)دا زۆر لە پێشنیازو پرۆژە پێشکەوتنخوازەکان بوەستێنن‌و رێگەیان لێبگرن. ئەمە یەك لەو هۆکارانەیە کە وایکردووە پرۆسەی سیاسیی سویسرا بە بەراوورد لەگەڵ پرۆسەی سیاسیی وڵاتانی دیکەدا هێواشترو لەسەرخۆترە.

وەلێ، لەلایەکی تردەوە، سیستمەکە سیاسەتسازان ناچار دەکا بیروراکانیان زۆر وەرگێرو هەلگێر پێ بکەنو، لەوانەیشە ولاتی سویسرای لەگەلێك بریاری هەلەشەو بەپەلەوە دوور خستبێتەوە، بەو مانایەی سیستمەکە دەشێ یەکێك بووبێت لەو فاکتەرانەی یارمەتی ئەوەیانداوە بەردەوامیی بە چەسپاویی‌و خۆراگریی سیاسیانەییان دابێت، ئەوەی هەر لە سەرەتای دروستبوونی فیدراسیۆنەکەوە لەسالی (١٨٤٨)دا تاکو ئیمرۆ درێژەی هەیەو بەردەوامە.

## ٣- هێزە بزوێنەرەکانی رامیاریی سەردەم

رۆژی یەکی کانوونی دووەمی سالی (٢٠٠٠) دەستوورێکی تازەی فیدرالیی شوێنی دەستوورەکەی سالی (١٨٧٤)ی گرتەوە. ئەمە نەك تەنها کۆتایی هێنا بە پرۆسەیەك کە پەرلەمانی فیدرالی سالی (١٩٦٥) دایهێنابوو، بگرە هەنگاوێکی یەکلاکەرەوەی پرۆسەکەش بوو. رای گشتیی لەو کاتەدا ئەوەبوو کە سیستمی رامیاریی سویسرا هی ئەوە نەبوو لەتەك گۆرانکارییە خێراو فرەوانەکانی سەردەمی دوای جەنگی دوهەمی جیهانیدا خۆی بگونجێنێت. دەستوورە تازەکە، بەبێ ئەوەی ناوەرۆکی پێوانەکانی دەستوورە کۆنەکە بگۆرێتو دەستکارییان تیادا بکات، رێکیاندەخاتەوە- بە بەکارهێنانی زمانی سەردەمیانەو بنیادنانەوەی تەرتیبەکانیان (رێزبەندییەکان).

هەروەها هەندێ ناوەڕۆکی تازەشی تیائاخنرا، بەتایبەتی بە ڕەچاوکردنی فیدرالیزمی هەرەوەزیی. ئەمەو، وێڕای پێداچوونەوە بە دەستوورەکەیش، هەمووارکردنی سەرەکیی لە سیستمی دادوەریی‌و دیموکراسییەتی ڕاستەوخۆ لەچەند ساڵی ڕابردوودا ئەنجامدراون، وەك لەخوارەوە باسکراون:

لەوانەیە گرنگترین پەرەسەندنی سەرنجڕاکێش لەو چەند ساڵانەی دواییەدا چوونی سویسرا بووبێت بۆ نێو نەتەوە یەکگرتووەکان لە (١٠) دەی ئەیلوولی (٢٠٠٠)دا، ئەمەیش لەئەنجامی ڕاپرسییەکی دەستوورییەوە کە تیایدا زۆرینەی (٥٥٪) پەنجاوپێنج لەسەدا دەنگی جەماوەرو، زۆرینەی (١١) یانزدە کانتۆنی تەواوو دوو نیوەکانتۆن پەسەندیان کردبوو. ئیتر، پێدەچێ لەو ساتەوەڕا ئەو بێنەوبەردەیەی کە سەردەمانێ لە لوتکەی گەرمییدا بوو بە ئێجگاریی‌و بەتەواوەتی لە هەستی جەماوەردا کوژابێتەوە.

جیا لەمەیش هێزە بزوێنەرەکانی سیاسی سەردەم بەردەوام کەوتوونەتە بەر کاریگەریی پەرەسەندنی ڕێکخستن‌و یەکگرتنی سویسرا، هەم لەڕووی جیهانیی هەم لە تەك ئەوروپاوە. لەگەڵ ئەمەشەوە، هەر لەو کاتەدا کە سویسرا زیاتر بەرەو یەکگرتن دەچێت. هەندێ بۆچوونی گشتیی دژو بەپێچەوانەی ئەو ڕەوتە لە ولاتەکەدا لە کاردان‌و کاریگەریان هەیە. بەم شێوەیە، بۆ نموونە، داواکاریی بیرۆکەی گۆڕانکاریی پێوەندیدار بە

پێکهاتەی سنووریی سویسراوە، لەوەتای یەکگرتنەوەی هەردووك کانتۆنی (جنێڤو ڤاود) (Genevak, Vaud) بە دەنگی جەماوەر (راپرسی) رەتکرایەوە، بایەخی جارانی خۆیی لەدەستداوە. هەروەها حزبی (spp) (حزبی گەلپەروەری سویسرا)ی کەنارگیر پێگەی خۆیی زێتر فرەوانو چەسپاوتر کردووە، بەتایبەتی لە کانتۆنە فەرەنسیزمانەکانداو، بۆی هەیە لە ئێستادا بانگەشەی ئەوە بکات کە حزبێکی نەتەوەییە. لە هەلبژاردنەکانی ئەنجومەنی یاسادانان لەمانگی ئۆکتۆبەر (تەشرینی یەکەم)ی ساڵی (٢٠٠٣)دا، بە بەدەستهێنانی زێتر لە (٢٧٪)ی دەنگی نەتەوە، ئەم حزبە بوو بە بەهێزترین حزب کە (٥٥) کورسیی لە کۆی (٢٠٠) دووسەد گورسییەکانی (ئەنجومەنی نیشتمانی) (Lower house)ی بەدەستهێنا. دەرەنجام، گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە حکومەتی هاوبەندیی کە لە ساڵی (١٩٥٩)وە لەسەر کاربووە بوو بە کارێکی ناچاریی بۆ هێشتنەوەو جێگیرکردنی هاوسەنگیی سیاسیی لە سیستمی دیموکراسیی نیمچە راستەوخۆی سویسرادا.

حزبی (spp) کورسییەکی دووەمیشی لە (ئەنجومەنی فیدرال-حکومەت) دا لەسەر حسابی (گروپی دیموکراتی کریستیانی) کە دەنگەکانیان لەدەستدابوون، وەرگرت. بەهۆی ئەم بەهێزبوونەی هێزە دوورەپارێزەکانەوە، (کەنارگیرەکان) چوونە نێو یەکێتی ئەوروپا (EU) لەهەر کاتێك زیاتر بەدوور دەزانرێت. بەم پێیە، کۆتایی هاتنی رێککەوتنە

دوو قۆڵییەکان لەگەڵ یەکێتی ئەوروپا (EU)دا بووە کارێکی دژوار بۆ ڕێکخستنو یەکگرتنی سویسرا لەنێو ئەوروپادا.

یەکەم ئەلقەی ڕێککەوتنەکان لە حوزەیرانی (٢٠٠٢)دا خرایە بەرکار کە ئەمانە دەگرێتەوە، توێژینەوە، داهاتی گشتیی، بەربەرستە تەکنیکییەکانی بەردەم بازرگانیی، کشتوکاڵ، فڕۆکەوانیی شارستانیی، گواستنەوەی سەرزەویی، لەگەڵ هاتووچۆی ئازادانەی تاکەکان. ئەلقەیەکی دووەم کە دانوستانی لەبارەوە کراوە، لەنێو زۆر بابەتی دیکەوە، خزمەتگوزارییەکان، ژینگەو پەروەردەش دەگرێتەخۆ. دانوستانەکان تەنانەت بۆ کێشە ئاڵۆزەکانیش درێژەیان هەیە، کێشەکانی وەکو وەستاندنی باجو گومرگو پێوەرەکان بۆ قەدەغەکردنی درۆو تەڵەکەبازیی‌و (ڕێگەگرتن لە گەندەڵی)و بەشداربوون لەبواری ئاسایشی گشتیی‌و چارەسەریش پێدەچێت وا بەرێوەبێ. ئەگەر بێتو سویسرا لە ئیمزاکردنی ئەم ڕێککەوتنانەدا سەرکەوتووبێت ئەو حەڵە بۆی دەلوێ لە زۆران سیاسەتگەلی گشتیی (EU) دا بەشداری بکات بێ ئەوەی لەسەری پێویست بکرێت کە بەشێوەیەکی سیاسیی لەنێو یەکێتییەکەدا وەرگیرابێت. کانتۆنەکان لەو دانوستانانەدا بەشداریدەکەن کە بەپێی دەستوورەکەی (١٩٩٩) بەڕێوەدەچن ئەوەیش مافی کانتۆنەکان بۆ بەشداربوون لە دروستکردنی بڕیارەکانی پەیوەست بە سیاسەتی دەرەوە بەگشتیی لە دانوستانە نێو دەوڵەتییەکانیشدا کە پەیوەستن بە

دەسەڵاتەکانیانەوە بەتایبەتی، بە پیرۆز دادەنێت. ئەو پەرەسەندنەش بەشێکە لە ئارەزووی گشتیی بۆ هاوسەنگیی دروستکردن لەنێوان لەدەستدانی پێ بەپێی خودموختاری کانتۆنەکان، لە دەرەنجامی هاریکاریی نێو دەوڵەتییەوە، لەگەڵ شێوازە تازەکانی فەرمانڕەوایی هاوبەش لەم جۆرە بابەتانەدا.

وەکو باسکرا، دوو هەموارکردنی بنەڕەتیی دەستووریی لەم چەند ساڵانەی دواییدا ئەنجامدراون. یەکەم، هەمواركردنێکی مافە گشتییەکان کە لە (۹) نۆی شوباتی (۲۰۰۳)دا خرایە دەنگدانەوەو پەسەندکرا. ئەم هەمواركردنە ڕێگا بۆ دەستپێشخەرییەکی گشتیی جەماوەریی خۆشدەکات (تاکو ئەو کاتە تەنها دەستپێشخەریی دەستووریی لەئارادابووە) هەروەها ڕێگا بە راپرسیی گشتیی دەدات بۆ ڕێککەوتنگەلی نێودەوڵەتیی کە پێوانەی یاسایی گرنگیان تیادابن، ئەگەر بگونجێت، لەتەك بەكارهێنانی یاسادا.

دووەم، ئەگەرچی گرنگە، لە روانگەی فیدرالییەوە، هەموارکردنو چاکسازیی سیستمی دادگەریی (بە راپرسییەکی دەستووریی لە ئاداری ۲۰۰۰دا پەسەند کراوە) زۆر گرنگترە. چونکە بناغە بۆ یەکخستنی شێوەی جێبەجێکردنی هەردوو یاسای تاوانکاریی‌و یاسای شارستانیی دادەنێت‌و بە شوێنەگۆڕکێی یەك لەدوای یەکی ۲۹و ۲۷ رژێمی جوداواز بە تەنها تاکە دەستورێکی فیدرالیی بۆ هەر یەکێکیان. وەك دەرەنجامێك

پێویست دەکات کانتۆنەکان دەستبەرداری بەشێکی گرنگی خۆبەڕێوەبردنی خۆیان بن لە بەڕێوەبەرایەتی دادگەرییدا.

بەدواداچوونو توێژینەوەو دادخوازیی تاوانی نەخشەبۆکێشراو (ڕێکخراو)،و دەستگیرۆیی دارایی تیرۆرزمو تاوانە ئابوورییەکان لە ئێستادا لە دەسەڵاتی فیدرالیدانە بەو پاساوەی کە تاوانکارییەکان بەزۆریو بەشێوەیەکی سەرەکیی لە دەرەوە یان لەنێو زیاتر لە کانتۆنەکاندا ئەنجامدراون. بەم ئامانجە هەردووك پۆلیسی فیدرالیو فەرمانگەی دادخوازو داواکارە گشتییەکان ڕێکخراون. بە هەموارکردنی سیستمی دادگەرییو چاکسازیی مافەکانی جەماوەر (خەڵك) هەموارکردنی ساڵی (١٩٩٩)ی دەستوور بە کۆتا هاتووە.

سەرەنجام، لەپاش مشتومڕێکی زۆردا چاکسازیی هاوسەنگییو یەکسانیی دارایی لەلایەن پەرلەمانەوە پەسەندکرا. وەکو لەچاپی یەکەمی ئەم کتێبەدا ئاماژەی پێکراوە، سیستمی دارایی سویسری بەوە دەناسرێ کە تاڕادەیەك مەرکەزییەتی بەهێزی هەیە لە خەرجییشی و هەم لە داهاتیشدا. هاوسەنگکردنی دارایی بە رەسمیی لەسەر ئاستی فیدراڵیدا تەنها ساڵی (١٩٥٩) پێشکەش کراوە ئەو دەمەی کە حکومەتی ناوەند بەپێی دەستوور ڕێی پێدرابوو کە کار بۆ هاوسەنگیی دارایی بکات لەنێوان کانتۆنەکاندا، هەموو پێوستییەکی کانتۆنەکان دەستەبەر بکات تا بتوانن ئەرکەکانیان جێبەجێبکەن، هەروەها ئاستێکی بنەڕەتیی (وەلێ

نایەکسان)ی خزمەتگوزاری بۆ گشت هاوولاتیان دابینو مسۆگەر بکات. ئامرازی سەرەکییش بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکانە بریتی بوو لە ئەو پارانەی ناوەند دەیبەخشنو هەروەها بەشداریکردنی کانتۆنەکانیش لە پێدانی ئەو پارانەی بۆ خەرجیی کارەکانی فیدرالی پێویست بوون بەپێی خشتەیەك کە لەسەر رێژەی توانستی دارایی بنیاتنراوە. بەداخەوە ئەم سیستمە هاوسەنگییەکی راستەقینەی زۆر کەم دێنێتە ئاراوەو لەمەڕ بە ئاسانی هاتوچۆو گواستنەوەی (السیولە)ی بازرگانییو لە دروستکردنی بڕیاراندا تەمومژاوییو نارۆشنە. دوایین کاریش کە لەلایەن پەرلەمانەوە لە ئەیلوولی (٢٠٠٣)دا دەنگی لەسەردرا بە گرتنەبەری رێوشوێنی ئەو پێشنیازە هاوبەشەوە بوو کە گرووپی کاری هاوبەشو تێکەلاوی فیدرالییو کانتۆنی خستبوویانە ڕوو.

بەتایبەتی، چاکسازییەکە:

١- بەرپرسیاریەتییە یەك لەدوای یەکەکان لێکدی جودا دەکاتەوە.

٢- هاریکاریی لەنێوان ئەو کانتۆنانەی بەپێی دەستوور بەشداریی باروبوکردنیان بەسەردا سەپێنراوە هاوتاو بەهێز دەکات.

٣- شێوازو رێبازگەلی تازەی هەرەوەزیی لە پانتاییەکانی بەرپرسیاریەتی هاوبەش (تێکەلاو) دادەهێنێت.

٤- سیستمێکی تازە بۆ هاوسەنگ کردنی دارایی راستەوخۆ دادێنێت.

ئەم سیستمە کەمترین خەڵاتو بەخشش بە کانتۆنەکان دەدات لەڕێگای ئاڵوگۆڕکردنو گواستنەوەی ئاسۆیی بێ مەرج لەنێوانیانداو، لەهەرجێیەك پێویست بکات لەلایەن فیدراڵەوە بۆیان تەواو دەکرێت.

ئەو هەروەها قەرەبووکردنەوەی ئاسۆیی زیانەکان (بەفیڕۆدانەکان)و دەستگیرۆیی ستوونیی بۆ بارو ئەرکە نا ئاساییەکان (جیۆگرافیی، تۆبۆگرافیی یان سۆسیۆ- دیمۆگرافی) دەگرێتەوە. گۆڕانەکان پێگەیەکی پتەوتر (بەهێزتر) بۆ پەرلەمان مسۆگەر دەکات، لەگەڵ شیمانەی بوونی راپرسییەك بەرەچاوکردنی گونجان لەگەڵ پیرۆکردنی رێککەوتنامە نێودەوڵەتییەکان سەبارەت بە کانتۆنە غەیرە حزبییەکانو، بەشداریی کردنی کانتۆنە دەوڵەمەندەکان لە هاوسەنگیکردنی ئاسۆییدا سنووردار دەکاتو، زەمینە دەرەخسێنێت بۆ درێژکردنەوەی ماوەی قۆناغەکانی دانەوەی قەردەکانو وادەی پارە ژماردن.

**خشتەی (١)**

**هێما سیاسیو جوگرافییەکان:-**

١- ژمارەو جۆری یەکە پێکهێنەرەکان: ٢٦ کانتۆن، (شەشیان نیوە کانتۆنن).

٢- زمانە فەرمییەکان: ئەڵمانیی، فەرەنسیی، ئیتاڵیی‌و رۆمانشیی.

٣- رووبەر: (٤١٣٠٠ کیلۆمەتری دوجا).

٤- رووبەر- مەزنترین یەکەی پێکهێنەر: گراوبۆنـدن (Graubunden)- ٧١٠٥کم٢.

٥- رووبەر- بـچووکترین یەکـەی پێکهێنـەر: باسـیل شـتات ( Basel Stadt)- ٣٧,٢کم٢.

٦- کۆی دانیشتوانان: ٧٢٢٨٠٠٠ کەس (ساڵی ٢٠٠٢).

٧- رێژەی سەدیی دانیشتوانانی یەکە پێکهێنەرەکان بۆ کۆی گـشتیی: زیـۆریخ ١٦,٩٪، بێـرن ١٣,٥٪، ڤـاود ٨,٦٪، ئارگـاو ٧,٦٪، سـانت گالـەن ٦,٢٪، جنێـف ٥,٧٪، تیـسینۆ ٤,٣٪، لـۆزان ٤,٨٪، ڤالێ ٣,٨٪ڤن باسیل لانشافت ٣,٦٪، سـۆلۆزان ٣,٤٪، فریبـورگ ٣,٣٪، نوشـاتیل ٣,٣٪، ثـورگـاو ٣,١٪، گراوبونـدن ٢,٦٪، باسیل شتات ٢,٣٪، شـوایز ١,٨٪، بێـرن ١,٧٪، زۆگ ١,٤٪، شـالفهاوزن ١٪، جـورا ١٪، ئـەپێنزل ئۆسـەر- رۆدن ٠,٧٪، گلاروس ٠,٥٪، نیدوالّن ٠,٥٪، ئۆبوالّدن ٠,٥٪، بووری ٠,٤٪، ئەپێنزل ئینەر- رۆدن ٠,٢٪.

٨- سیستمی رامیاریی: فیدراڵیی- کۆماریی فیدراڵیی.

٩- سەرۆکی دەوڵەت- فیدراڵ:- سەرکۆمار، پۆستێکی رەسمیی و کـەم دەسـەڵات. سـاڵانە لـەنێوان ئەنـدامانی ئەنجومـەنی فیدراڵیـدا دەخولێتەوە. سەرۆك بۆ ماوەی یەك ساڵ دادەنرێت و سـەرۆکایەتی

کابینە یان (ئەنجومـەنی فیـدراڵی) دەکـات کەلـە حـەوت نوێنـەر پێکدێت کە بۆماوەی چوار ساڵان بەردەوام دەبن لە کارەکانیاندا.

هەردوك، سەرۆكو ئەنجومەنەکەیش لە لایەن (ئەنجومـەنی فیدرالییـەوە) هەڵدەبژێردرێن.

١٠-سـەرۆکی حکومـەت- فیـدرال: سـەرۆك جۆزیـف دایـس ( Joseph Deiss) (لە یەکی کانوونی دوهەمی ٢٠٠٤ەوە). دەسەڵاتو ئەرکەکانی سەرۆکی حکومەت بە بەشداریی هەر حەوت ئەندامـەکانی ئەنجومـەنی فیدراڵییەوە بە ئەنجام دەدرێـن (تێبینـی: سـەرۆك وەك "یەکـەمی بـە تواناکـان" رۆڵ دەبینـن) وەلێ ئـەو دەسـەڵاتە بەرفراوانـەی نییـە کـە عادەتەن بە سەرۆکێك دەدرێت).

١١- بونیـادی حکومـەت- فیـدرال: دوو ئەنجومـەنی پەرلـەمان. ئەنجومەنی فیدرالی سویسرا: دوهەم ئەنجومەن: ئەنجومەنی ویلایەتـەکان (Standerat) ٤٦ کورسیی، ئەندامانی ماوەی چوار ساڵ دەمێننەوە: یەکەم ئەنجومەن: ئەنجومەنی نیشتمانیی (Nationalrat)، ٢٠٠ دووسـەد کورسیی: ئەندامانی راستەوخۆ بۆ ماوەی چوار سـاڵان هەڵدەبـژێردرێن. بـەگوێرەی رێـژەی دانیـشتوانانی هـەر کانتۆنێـك بـۆ کـۆی گـشتیی، (پێویستە هەر کانتۆنێ لانی کەم نوێنەرێکی هەبێت).

١٢- کانتۆنی زیۆریخ کە خاوەنی زۆرترین ژمارەی دانیشتوانانە ٣٤ سـیو چوار نوێنەری لە ئەنجومەنی لۆوەری (Lower)ی حکومەتی فیدرالیدا

هەیە. کانتۆنەکانی (ئەپێنزیل نۆسەر- رۆدنو ئەپنێزل ئینەر- رۆدنو گلاروس‌و نیدواڵدن‌و، هەروەها (یووری) ئەوانەی نزمترین رێژەی دانیشتوانانیان هەنە، هەر یەکێکیان تەنها یەك کورسییان هەیە.

١٣- دابەشبوونی نوێنەرایەتیکردن لە ئەنجومەنی باڵا (Upper house)ی حکومەتی فیدرالیدا:- هەریەك لە (٢٠) بیست کانتۆنە تەواوەکان دوو کورسیی‌و هەر یەك لە (٦) شەش نیوە کانتۆنەکان یەك کورسییان هەنە. پرۆسەو هەنگاوەکانی هەڵبژاردن بە یاسای کانتۆنی بڕیاری لێدەدرێت‌و دەشێ لە کانتۆنێکەوە بۆ یەکێکی تر جوداوازبێت.

١٤- دابەشبوونی دەسەڵاتەکان:- تەنها حکومەتی ناوەند (فیدراڵ) دەسەڵاتی یاسادانانی هەیە لە بوارەکانی (کاروبارەکانی دەرەوە، بەرگریکردن، رەگەزنامە، بازرگانیی ناوخۆیی‌و دەرەوە، پارە دەرکردن، بەنکەکان، هێڵی ئاسن، خزمەتگوزاریی گەیاندن، کشتوکاڵ‌و وزەی ناووکی) کانتۆنەکان خودموختاریی داراییان هەیە، لەگەڵ مافی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ناوخۆیی کانتۆنەکان. ئەوان دەسەڵاتیان هەیە بەسەر بابەتگەلی وەك (شارەوانییەکان، پەروەردە، رۆشنبیریی (کەلتوور)، نیزامی گشتیی (سەقامگیریی)و ژێرخان. دەسەڵاتە هاوبەشەکان (کۆچکردن‌و ئاسایشی گشتیی‌و ناوخۆیی)

دەگرێتەوە. حکومەتی ناوەندو کانتۆنەکان هەردوولا دەسەڵاتی سەپاندنی باجیان هەیە.

١٥- پاشماوەی دەسەڵاتەکان (دەسەڵاتەکانی تر):- ئەو دەسەڵاتانەی کە ماونەتەوە بۆ کانتۆنەکان دەگەڕێنەوە.

١٦- دادگەی دەستووریی (باڵاترین دادگەی پەیوەست بە بابەتە دەستوورییەکان): دادگەی فیدرالی هەرچەندە باڵاترین دادگەیە، کەچی دەسەڵاتی پێداچوونەوەی دادگەرییەکانی نییە.

١٧- سیستمی رامیاریی یەکە پێکهێنەرەکان:- یەك ئەنجومەنی یاسایی:- پەرلەمان، یان ئەنجومەنی دەوڵەت ( Kantonsrat, Grosser Rat or Grand Conseil) ئەندامان راستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن. بە نیسبەت کانتۆنەکانی (ئەپێنزل نینەر_ رۆدنو گلارەس)دوە (ئەنجومەنێکی (کراوە) دەرەوە)ش هەیە بۆ سەرجەم دەنگدەران (ئەم ئەنجومەنە شوێنی پارلەمان ناگرێتەوە. بەڵکو پاشکۆو تەواوکەریەتی. ئەنجومەنە دەوڵەتییەکان لە (٥) پێنج تا (٩) نۆ ئەندامان پێکدێن.

تێبینی: سیستەمە رامیارییەکانی کانتۆنەکان زۆر لە یەکدییەوە جیاوازن.

١٨- سەرۆکی حکومەت- یەکە پێکهێنەرەکان:- سەرۆك یان وتەبێژی ئەنجومەنی بەرێوەبردن (کارگێریی) لەلایەن (پەرلەمانەوە) دادەمەزرێت. ئەو سەرۆکایەتییە هەموو ساڵێك دەگۆڕێت (سەرۆکایەتییەکی خولاوە).

خشتەی (٢)

## هێما ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکان

| | |
|---|---|
| ١ - GDP کۆی داهاتی گشتیی ساڵانە | ٢٠٥ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی (ساڵی ٢٠٠٢) |
| ٢ - پشکی تاك لە داهات | ٢٨٣٥٧ دۆلار (ساڵی ٢٠٠٢) |
| ٣ - قەردی نیشتمانیی (دەرەکی) | ٦٨٤,٨ بلیۆن دۆلار (ئەیلول- ٢٠٠٣) |
| ٤ - قەردی لاوەکی (ناڕاستەوخۆ) نیشتمانیی | ٧٨,٦ بلیۆن دۆلار (ساڵی ٢٠٠٢) |
| ٥ - ڕێژەی بێکاریی نیشتمانیی | ٢,٥٪ (ساڵی ٢٠٠٢) |
| ٦ - یەکەی پێکهێنەری خاوەن بەرزترین ڕێژەی بێکاریی | جنێف- ٥,٤٪ (ساڵی ٢٠٠٣) |
| ٧ - یەکەی پێکهێنەری خاوەن نزمترین ڕێژەی بێکاریی | ئەپێنزل ئینەر- ڕۆودن ٠,٩٪ (٢٠٠٣) |
| ٨ - ڕێژەی خوێندەواریی هەرزەکاران | زیاتر لە ٩٥٪ |
| ٩ - خەرجیی نەتەوەیی بۆ پەروەردە وەك ڕێژەی سەدی لە داهاتی گشتیی | ٥,٥٪ |
| ١٠ - تەمەنی چاوەڕوانکراو بەساڵ | ٧٩,٠ (ساڵی ٢٠٠١) |
| ١١ - داهاتی حکومەتی فیدرال لە گومرگو باجو سەرچاوە هاوشێوەکان | ٢٧,٥ بلیۆن دۆلار (ساڵی ٢٠٠٢) |
| ١٢ - داهاتی یەکە پێکهێنەرەکان لە باجو گومرگو سەرچاوە هاوشێوەکان | ٣٤,٦ بلیۆن دۆلار (ساڵی ٢٠٠٢) |

| | |
|---|---|
| ١٣- یارمەتییەکانی فیدرال بۆ یەکە پێکهێنەرەکان | ٥,٧ بلیۆن دۆلار (سالی ٢٠٠١) |
| ١٤- میکانیزمەکانی هاوسەنگی (یەکسانیی) کردن | بەشداریکردنی داهاتی فیدرال بەگوێرەی توانستی دارایی کانتۆنەکان پێڕەو دەکرێت. |

# هیند

نووسینی: جۆرج ماثیو GEORGE MATHEW

## ١- دیرۆك و پەرەسەندنی فیدرالیزم

رووبەری هیند (٣,٢٨) ملیۆن کیلۆمەتری دوجایەو ژماری دانیشتووانەکەی لە ساڵی (٢٠٠٢)دا (١,٠٤٨) هەزارو چلو هەشت ملیۆن کەس بوون. وڵاتی هیند پانتاییەکی فرەوانی پاشخانی ئەتنیو زمانەوانییو فەرهەنگو کەلتوورگەلی هەمەجۆری هەیە.

هیندستان لە (٢٨) ویلایەتو (٧) حەوت ناوچەی یەکگرتوو (UTS) پێکهاتووە، (بە دەلهی یشەوە کە ناوچەی پایتەختی نیشتمانییە)و لە رووی سەرچاوە سرووشتییەکانیانو توانستی کارگێڕییو بەرهەمەکانو کارو دەستکەوتی ئابوورییانەوە لە یەکتری جوداوازن. هێشتاش وڵاتەکە هەژارییو نەدارییەکی چڕی تیادایە. بەپێی ئامارەکانی (١٩٩٩-٢٠٠٠)ەوە نزیکەی (٢٦٠) دووسەدو شەست ملیۆن کەس لەژێر هێڵی هەژارییدان ((٢٦٪)ی سەرجەمی دانیشتووانان))، کەچی ساڵی (٢٠٠٠-

٢٠٠١) هیند توانیی کۆی داهـاتی گـشتیی سـالانەی بـە ڕێـژەی (٦٪) بەرزکاتەوە.

سالّی ١٨٥٨، لەدوای یـەك سـەدەی حـوکمی کۆلۆنیـالیی لـە لایـەن (کۆمپانیـای هینـدیی خۆرهـەلاتی بەریتانییـەوە) تـاجی بـەریتانیی بەڕێوەبردنی ولاتـی هینـدی گرتەدەسـتو شـێوە حوکڕانییـەکی نێجگـار ناوەنـدیی (مەرکـەزی) دامـەزرێنرا کـە دەسـەلاتەکانی یاسـادانان، جێبـەجێکردنو ئـابووری ولات تیایـدا لـە دەسـتی (حـاکمی گـشتیی)دا کۆکرابوونەوە، کە وەك بریکار (نوێنەر)ی حکومەتی بەریتانیا کاریدەکرد.

ئەوەبوو، ئاستەنگەکانی بەردەم پێڕەوکردنی حوکمی نێوەنـدیی بوونـە هۆکار بۆ دابەشکردنی دەسەلاتەکان کە بەپێی قـانوونی سـالّی (١٨٦١)ی ئەنجوومەنـەکانو دواتـریش قـانوونی (مینتـۆ-مـۆرلی) (Minto Morly) جێبەجێدەکران. خودموختاری هەرێمایەتیش بەپێی قـانوونی ( -Montaguc Chelmsford)ی سالّی (١٩٠٩) هاتە ئاراوە، ئەوەی پرەنسیپی (حکومەتی بەرپرسیار)ی لە هەرێمەکاندا خستەڕوو. ئەگەرچی بۆ تەنها چەند کاروباری دیاریکراویش بووبێت.

لەو ماوەیەدا حکومەتی بەریتانیا بە پەرۆشـەوە خـەریکی جلـەوگیریی بزووتنەوەی نیشتمانیی هیندو چەسپاندنی دەسەلاتی خۆی بوو بەسەر ئـەو ولاتەدا.

جا، (ڕاپۆرتی کۆمیسیۆنی سیمۆن ساڵی ١٩٣٠)و (کۆنفرانسی مێزی بازنەیی)و دواتریش (قانوونی حکومەتی هیند ساڵی ١٩٣٥) هەموویان هەوڵدان بۆ گەیشتن بەو ئامانجە بوون.

قانوونەکەی حکومەتی هیند ئاورێژێك بوو لە بونیادی فیدرالی دەربەگیی ئەو سەردەمەدا کە کاری بۆ هێنانەدی فیدراسیۆنێك دەکرد بە ڕێگەی پێکەوە ڕێکخستنی ناوچەکانی هیندی بەریتانیایی‌و ویلایەتە هیندییەکانی ناسراو بە ویلایەتە شازادەییەکان کە لەلایەن شاهانەوە حوکم دەکران. ئەو ویلایەتە شازادەییانە لەوەدا سەرپشك کرابوون بچنە ناو فیدراسیۆنەکەوە، یان نەء. وەختێکیش ڕەزامەندییان بە دەستنەهات فیدراسیۆنەکە ئەو کاریگەرییەی نەما وەك نەخشەی بۆ کێشرابوو.

قانوونەکەی ساڵی ١٩٣٥یش دەسەڵاتە یاساییەکانی لەنێوان ئەنجوومەنەکانی یاسادانانی هەرێمەکان‌و نێوەندا دابەشکراو، هەرێمەکان لە سنووری دیاریکراوی خۆیاندا بریتیبوون لە یەکە گەلی کارگێڕیی ئۆتۆنۆمی خاوەن دەسەڵاتی سنووردار. تا ئەو جێگەیە حکومەتی هیند ڕۆڵی حکومەتێکی فیدراڵیی دەدیت لە بەرامبەر حکومەتە هەرێمایەتیەکاندا، بەبێ ویلایەتە شازادەییەکانەوە. ئەو ڕێکخستنەیش بە هەڵگیرسانی جەنگی دوهەمی جیهانیی کۆتایی پێهات.

هیندستان لە (١٥)ی ئابی (١٩٤٧)دا سەربەخۆیی بەدەستهێنا. دەستوورەکەشیی ڕۆژی (٢٦)ی نۆڤێمبەری (تەشرینی دوهەم)ی ١٩٤٩دا

لەلایەن (ئەنجومەنی پێداچوونەوەی دەستوور)ەوە پەسەندکراو، ڕۆژی (٢٦)ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٠ خرایە بەرکارەوە. دەستوورەکە پێشبینی ناوەندێکی بەهێزی دەکرد. هەر چواردە ویلایەت‌و شەش ناوچە یەکگرتووەکان بەگوێرەی ئەو چوارچێوە مێژووییانەیانەوە کە تیایدا حوکمکرابوون‌و بەڕێوەبردرابوون دابەشکرانەوە.

ساڵی ١٩٥٥ (کۆمیسۆنی ڕێکخستنەوەی ویلایەتەکان) هاتە دامەزراندن. واش دانرابوو ڕێکخستنەوەیەکی ناوچەیی لەسەر ئەم پرەنسیپانەوە بنیات بنرێت: (پاراستن‌و بەهێزکردنی یەکێتی‌و ئاسایشی هیند، یەکشێوەیی‌و چۆنیەکیی زمان‌و کەلتوور، هەروەها بەتەنگەوەهاتنی لایەنەکانی دارایی‌و ئابووریی‌و کارگێڕیی، فاکتەری زمانەوانیی چونکە زمان پەیوەستە بە ناسنامەی سۆسیۆ- کەلتوورییەوە (کەلتووری کۆمەڵایەتی)و، ڕۆڵی هەرە گرنگی هەبوو لە بڕیاردانی دووبارە ڕێکخستنەوەی یەکە پێکهێنەرەکانیدا. بۆچوون وابوو کە ئەو قانوونەی بەنێوی (قانوونی ڕێکخستنەوەی ویلایەتەکانی ساڵی ١٩٥٦)ی لێکەوتەوە، ئەوەی بەشێوەیەکی سەرەکیی ویلایەتەکانی لەسەر بناغەی ئەو زمانانەوە ڕێکخستنەوە کە لە دەڤەرەکەدا قسەیان پێدەکرا دەشیا چارەسەری گونجا دەستبەر بکات بۆ کێشەگەلی هەمە چەشنەی وەك نایەکسانیی ئابووریی، پەرەسەندنی لاسەنگ‌و نارێك، یاخود باڵادەستبوونی چین‌و توێژی تایبەتی. هەر لە ساڵی (١٩٥٦)ەوە ژمارەیەك

پێشڤەچوون لە ویلایەتەکاندا ئەنجامدراون، هەرە تازەترینیان دروستکردنی سێ ویلایەتی بچووکی نوێ بوون لە باکووری خۆرهەڵاتدا (چاتیسگار، جەهارکاندو ئۆتارانچاڵ) کەلە مانگی تەشرینی دوهەمی ساڵی ٢٠٠٠دا لە ویلایەتەکانی دیکەوە دابڕێنران.

ئەو دەمەی دەستوورەکەی تیادا نووسرا خەمی هەرە گەورەی (باوکانی دامەزرێنەر) ئەوەبوو یەکێتیو یەکپارچەیی هندستان بپارێزن کە لەکاتی سەربەخۆییدا زێتر لە (٦٠٠) شەش سەد ویلایەنگەلی شازادەیی جوداوازی لەتەك ناوچەکانی هیندی بەریتانیاییدا هەبوون. بێگومان لەهیچ شوێنێکی دەستوورەکەدا ووشەی (فیدرالی) باس نەکراوە- دەستوورەکە دەڵێت: (هیند "یەکێتی ویلایەتەکانە"و مەرکەزییەتێکی بەهێز دەخاتە روو).

بی. ئار. ئامبدکار (B. R. Ambedkar) ئەندازیاری دەستووری هیندستان گوتوویە: "بەکارهێنانی ووشەی (یەکێتی) وەك قۆناغێك وابوو" کۆمیتەی نووسینی پرۆژە یاساکە ویستی ئەوە روونکاتەوە کە: "ئەگەرچی هیندستان دەبووا ببێتە (فیدراسیۆنێك) دەرەنجامی رێککەوتنێك بە دەستپێشخەریکردنی ویلایەتەپێکهێنەرەکانی نەبووە". لەکاتە ئاساییەکاندا هیند وەکو (فیدراسیۆن) کار دەکات، کەچی، لە بارودۆخە نا ئاساییەکاندا دەکرێو روشیداوە کە ببێتەوە بە وڵاتێکی مەرکەزیی یەکپارچەو یەکگرتوو.

### ٢- ( ماددەو مەرجە دەستووریەکان سەبارەت بە فیدرالیزم )

هیند کۆمارێکی فیدرالیی خاوەن سیستمێکی پەرلەمانییەو لە ٢٨ یەکەی بەشدار پێکهاتووە، کە (٣) سیانیان وەك لەسەرەوەدا باسکراوە تەنها بەم دواییانە دروستکرابوون. پەرلەمانە فیدرالییەکەی دوو ئەنجومەنییە (دوو ئەنجومەنی هەیە)، لە راجیاسابها (Ragya Sabha) (یان ئەنجومەنی ویلایەتەکان)- ئەنجومەنی ئەپەر هاوس)و لۆك سابها ( The Lok Sabha) (یان ئەنجومەنی خەلك- لۆوەر هاوس) پێکدێت. توێژەرەوەو زانایان ئەوانەی لەماوەی ئەو پەنجا ساڵەی دواییەدا لەبارەی هیندەوە لێکۆڵینەوەیان کردووە، سیستمی رامیاریی هیندیان بەوە وەسپکردووە کە (فیدراسیۆنێکی بێ فیدرالیزمە)و بەشێوەی هەمەجۆر ئاماژەیان بە فیدرالیزمەکەی داوە وەك (هەرەوەزیی، کە بۆ جێبەجێکردن شیاوە، تازە باهەت، بەرپرسیار، پەرلەمانتیاریی، جەماوەریی (گەلی)، یاسادانەر، تایبەت بە کێبڕکێ، دارایی، بنیاتنراوە، نەخوازراو یان (ڕووالەتیی).

هەرچییەك بێت، رەگەزی فیدرالییەت وەك پرەنسیپێکی شاراوە بووە لە سیاسەتی فەرمانڕەوایی هیندستاندا سەرەڕای چەندان هەوڵی (نێوەند) بۆ قۆرخکردنی دەسەڵاتەکانو زەوتکردنی مافی دەسەڵاتی دادگەریی ویلایەتەکان بەڕێگای قانوونەکانی پەرلەمانەوە. لە دەستووردا چەند ماددیەك هەن کە ڕێگە بە (نێوەند) دەدەن دەست بەسەر مافەکانی

ویلایەتەکان دابگرێت. یەکەم: لەژێر ماددەی (٢٤٩)دا هاتووە (ئەگەر راجیا سابها - ئەپەر هاوسی پەرلەمان- رابگەیەنێت، بە بڕیارێك کە ٢/٣ دوو لەسەر سێی ئەندامە ئامادەبووەکان لاگیریی لێبکەنو دەنگی بۆ بدەن بۆ مەبەستی رێککەوتنو بەرژەوەندیی نەتەوەیی، کە پەرلەمان پێویستە قانوونان دەربچوێنێت بە لەبەرچاوگرتنی هەر بابەتێك لەسەر (لیستی دەولەت) حسابکرابێت، ئەوا پەرلەمان بۆی هەیەو دەتوانێ ئەو کارە بەئەنجام بگەیەنێ). بڕیارێکی لەو جۆرەش بۆ ماوەی یەك ساڵ بەرکاردەبێتو، دەشکرێ بۆ ساڵێکی دیکەش درێژبکرێتەوە. خشتەی حەوتەمی دەستوورەکە ئەرکەکانو دابەشبوونی دەسەلاتەکان لەنێوان حکومەتی یەکێتیو حکومەتەکانی ویلایەتەکاندا دیاریدەکات. (لیستی یەکێتی) ٩٧ بڕگەییو (لیستی ویلایەت) بە ٦٦ بڕگەو (لیستی هاوبەش)ی دەسەلاتو مافەکان بە ٤٧ بڕگەوە هەنە. هەندێ لە بەندو ماددە گرنگەکانی (لیستی یەکێتی) تایبەتن بە: بەرگریی، ووزەی ناوکی (ئەتۆم)، راوێژکاریی دیبلۆماسییو نوێنەراتیکردنی بازرگانیی، رەگەزنامە (هاولاتیبوون)، رادەستکردنەوەی گومانلێکراوو تاوانبار، بازرگانیکردنی نێوان ویلایەتەکان، پێداچوونەوەی حیساباتەکان، دەرکردنی پارەو دراو، هەروەها چاودێرییو سەرپەرشتی کردنی یاساییو ئالوگۆڕیی دەرەکیی. لەکاتێکدا (لیستی ویلایەت) لەنێوان شتهای تردا ئەوانە لەخۆدەگرێت: نیزامو ئاسایشی گشتی،حکومەتی خۆجێیەتی، ساخلەمییو تەندروستی

گتشتیی، پێوەندیی و گەیاندنەکان، کشتوکاڵ، ماسیگرتن، بازرگانیکردن لەنێو ویلایەتەکاندا. باج و گومرگ و پۆلیس. ئەمەو، یاساکانی تاوان، جەنگەڵ و دارستانەکان، نەخشەو پلاندانانی ئابووریی و کۆمەڵایەتی (سۆشیال)، یەکێتییەکانی بازرگانی، پەروەردەو دەستبەسەرکردنی کاتیی چەند ماددەیەکی گرنگی ناو (لیستە هاوبەشەکەن). ئەمەو، بە تێپەڕبوونی ساڵان گۆڕانکاریی بەسەر لیستەکاندا هات کە لە بەرژەوەندیی حکومەتی (ناوەند)دا بوون.

دووهەم بڕگەی دەستووریی کە ماوە بە (نێوەند) دەدات مافەکانی ویلایەتەکان قۆرخ بکات ماددەی (٢٥٠)یە. بەپێی ئەو ماددەیە پەرلەمان بۆی هەیە یاسا بۆ هەر بابەتێکی نێو (لیستی ویلایەت) دەربکات بۆ سەرجەم یان هەر بەشێکی هیندستان.

لەکاتی ڕاگەیاندنی باری (نا ناسایی)دا، حکومەتی نێوەند بەپێی ماددەی (٣٥٢) دەسەڵاتی ئەوەیشی هەیە بڕیار بدات کەی (باری نائاسایی) پێویست دەبێت. باری نائاسایی بەپێی ماددەکەوە لە مانگی نۆکتۆبەری ساڵی ١٩٦٢دا ڕاگەینرا (کێشەو قەیرانی- سینۆ- هیند)و ساڵی ١٩٦٨ هەڵوەشێنرایەوە. هەروەها لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧١ (شەڕ لەگەڵ پاکستان) داو، مانگی ئاداری ١٩٧٧ هەڵوەشێنرایەوە. هەروەها، پەرلەمان بەسوود وەرگرتن لە ماددەی (٢٥٠) پێنج بابەتی لە (لیستی ویلایەتەکان) دابڕیوەو، پێنج بڕگەی خستۆتە سەر

(لیستی هاوبەش)و ۳ سێ برگەیشی هاوێشتۆتە سەر (لیستی یەکێتی)یەوە. ناوەها، بۆ نموونە، قانوونی دەستوورەکە (سێهەم گۆڕانکایی) سالّی ۱۹٥٤ خشتەی حەوتەمی گۆڕیی‌و چاککردو پانتایی ماددەو برگەکانی (لیستی هاوبەش)ی فرەوانترکرد. ئەمەیش پەیوەست بوو بە بازرگانیی ناوەوەو دەرەوە، بەرهەمهێنان، هێنان‌و دابەشکردنی بەرهەمە پیشەسازییەکان، خۆراك، ئالیکی ئاژەل‌و گاگەل‌و لۆکە (پەمۆ)وە. بە یاسای دەستوور سالّی ۱۹٥٦ (چاککردنی شەشەم) حکومەتی یەکێتی دەسەلاتی پێدرا کە رادەدیەکی زیاتر باج لەسەر کەلوپەلی بازرگانیی نێوان ویلایەتەکاندا بسەپێنێت.

قانوونی دەستوور سالّی ۱۹۸۲ (چاککردن‌و هەموارکردنی چوارەم) دەسەلاتی بە (یەکێتی) داوە لە بازرگانیکردنی نێوان ویلایەتەکاندا گومرگ لەسەر هەناردەی شتوومەك دابنێت. قانوونی دەستوور سالّی ۱۹۷٦( چل‌و دووەمین هەموارکردن) گۆڕانکاریی زۆری لە خشتەی حەوتەمدا کردووە، بەراگواستنی ئەو برگانەی پەیوەستن بە (پەروەردە، جەنگەلّستان، پاراستنی ژیانی گیاندارو رووەکی کێویی، کێش‌و پێوانەکان) لە (لیستی ویلایەتەکانەوە بۆ سەر لیستی هاوبەش)، لە هەمووی گرنگتر، گۆڕانکارییەکە دەسەلاتی بە (یەکێتی) داوە. بۆ بلاوکردنەوەی هێزەکانی لە هەریەك لە ویلایەتەکانداو، لەهەمان کاتیشدا کۆنترۆلّ بەسەر هێزە چەکدارەکان بۆخۆی بهێلّێتەوە. بەمەش کۆنترۆلّی

حکومەتەکانی ویلایەتە پێوەندیدارەکان بەسەر ئەو هێزە چەکدارانەوە کە بڵاوکراونەتەوە کەمدەکاتەوە.

سێهەم برگە ئەوەی رێگە دەدات بە (نێوەند) دەست بخاتە کاروباری دادگەریی ویلایەتەکانەوە ماددەی (٣٥٦)ە. بە حوکمی ماددەکەوە (فەرمانی سەرۆك) کە بەهۆیەوە حکومەتی نێوەند دەتوانێ راستەوخۆ دەست بەسەر حکومەتی ویلایەتێکدا بگرێت لەساڵی ١٩٥٠دوە پتر لە سەد جاران بەسەر ویلایەتەکاندا سەپێنراوە، ئەمەیش رەخنەی توندو دژواری ورووژاندووە بەوەی کە دەستدرێژییە بۆسەر تایبەتمەندی فیدراڵیی هیندستانو، ساڵی ١٩٩٤ (دادگەی هەرەباڵای هیند) بریاری ئەوەیدا کە دەسەڵاتی حکومەتی (نێوەند) بە حوکمی ماددەی (٣٥٦) بۆ لێیەخستنی حکومەتی ویلایەتێكو لادانی لەسەر حوکم دەسەڵاتێکی رەها نەبووە، بەڵکو دەسەڵاتێکی مەرجدار بووە.

چاکسازیی لە دەستووری هینددا دەکرێ بەسێ رێگە ئەنجام بدرێت:

یەکەم: ئەو برگەو ماددانەی دەستوور کە (ناشێت بە دەستوور هەموار بکرێت) دەتوانرێ پەرلەمان بە زۆرینەیەکی ساکار (ئاسایی) بیانگۆرێت.

دووەم: لەچەند بارێکی (حالەت)تردا، دەبێت پرۆژە یاسایەك لەهەر یەکێك لە ئەنجومەنەکانی پەرلەماندا بخرێنەروو (پێشکەش بکرێت)و لەهەر دوو ئەنجومەنەکاندا تێپەرێت بە زۆرینەیەك لەکۆی گشتی ئەندامەکانی ئەو ئەنجوومەنەوەو زۆرینەیەکی کە کەمتر نەبێت لە ٣/٢

دوو لەسەر سێی ئەندامانی ئەو ئەنجومەنە، ئەوانەی ئامادەو بەشداریی دەنگدانەکە بوون. بە دەستەبەرکردنی رەزامەندیی سەرۆکیش دەستوورەکە هەموار دەکرێت.

سێهەمیش: دەربارەی ئەو ماددانەی کار لە بونیادی فیدرالی ولاتدا دەکەن وا پێویست دەکات رەزامەندیی دەستەی یاسادانانی لانی کەم نیوەی ویلایەتەکان مسۆگەر بکرێت.

دوابەدوای ئەنجامدانی ئەو رێوشوێنانەی لە خالّی دووهەمی سەرەوەدا باسیان لێوەکراوە بەر لەوەی پرۆژە یاساکە بۆ وەرگرتنی رەزامەندیی سەرۆك بخرێتە بەردەم سەرۆك کۆماردوە.

لەلایەکی ترەوە پێوەندییەکانی نێوان حکومەتی نێوەندو ویلایەتەکان زۆر کات ئالۆزو پرکێشە بووە، بۆیەکا دەستەیەکی یاسایی بەناوی (ئەنجومەنی نێوان ویلایەتەکان) دامەزرێنراوە بە مەبەستی تاوتوێکردنی پێوەندییەکانی نێوان ویلایەتەکانەوە. ماددەی (٢٦٣)ی دەستوور دەلّێت "ئەگەر هەر کاتێ بۆ (سەرۆك) دەرکەوت کە بەرژەوەندیی گشتی تێدایە ئەوا بۆی هەیە ئەنجومەنێك دامەزرێنێتو سروشتی ئەرکەکانی بۆ دیاریی بکات. بەشێوەیەکی گشتیی، ئەنجومەنەکە ئەم کارانەی پێ سپێردراوە:

١. توێژینەوەو ئامۆژگاریکردن دەربارەی ئەو ناکۆکییانەی دەشێ لەنێوان ویلایەتەکاندا روویاندابێت.

٢. پشکنینو گەنگەشەکردن لەسەر ئەو بابەتانەی هەندێ یان هەموو ویلایەتەکان، یاخود (یەکێتی)و یەك یان زیاتر لە ویلایەتەکان بەرژەوەندییەکی هاوبەشیان تیادا هەبێت.

٣. راسپاردنو پەسەندکردن، بەتایبەتی راسپاردنی پەیوەست بە رێکخستنو هاوتاکردنی سیاسەتو کارکردن بەرەچاوکردنی هەر بابەتێك کە کێشەی لەسەر بێتو مایەی ناکۆکییو گفتۆکردن بێ.

(دادگەی هەرە باڵای هیندستان) پارێزگاری دەستووری هیندە، (ماددەی ١٢٤) لە ئێستادا، دادگەکە لە دادوەرێکی سەرەکی (سەرۆك)و ٢٥ دادوەر پێکدێ کە لەلایەن سەرۆکی وڵاتەوە دامەزرێنراون. دادگە لە کێشەگەلی نێوان ویلایەتەکانو کێشەکانی نێوان (یەکێتی)و ویلایەتەکاندا دوایین سەرپشك دەبێت. تێبینی کراوە کە دادوەرییو دەسەڵاتەکانی دادگەی هەرە باڵای هیندستان لە سروشتو مەودایان لە ئەوانەی لە لایەن باڵاترین دادگەکانی وڵاتانی تردا پیادەکراون فرەوانترن.

دەسەڵاتەکانی باجدانانی (یەکێتی)و ویلایەتەکان لێك جوداکراونەتەوە. لیستی یەکێتی ١٢ دوانزدە بابەتی باجدانان لەخۆ دەگرێتو ، لیستی ویلایەت ١٩ نۆزدە بابەت، هەروەکو دامەزراوە خۆجێییەکانی شارەکانو لادێکانیش دەسەڵاتی باجدانانیان هەیە.

لە بابەتەکانی پەیوەست بە دارایی دەکرێ بڵێین بۆچوونی سەرەکیی لایەنگیریی مەرکەزییەت دەکاتو بەم پێیە حکومەتی نێوەند بەهێزتر

دەکات. پەرەسەندنەکانی چل ساڵی دوایی ئەوە نیشاندەدات پەیمانگەو لایەنە ئابوورییەکان خوازیاری پشتگیریی‌و هاندانی جۆرێك سیستمگەلی بەڕێوەبردن بوون کە بە تەواوەتی لەگەڵ بیرۆکەو مەفهوومی فیدرالیزمدا ناگونجێن.

ماددەی (٢٨٠)ی دەستوور ڕێگە بە دروستکردنی (کۆمیسیۆنی دارایی ناوەندیی) دەدات لەلایەن سەرۆکی وڵاتەوە هەر پێنج ساڵ جارێك. ئەو کۆمیسیۆنە لە سەرۆکێك‌و چوار ئەندامی تر پێکدێت کە سەرۆکی ولات دایاندەمەزرێنێت. کۆمیسیۆن ڕاسپاردەو ڕێنمایی پێویست لەمەڕ پێوەندییە داراییەکانی ویلایەت‌و نێوەند پێشکەش دەکات. ڕاسپاردەکانیشی لەسەر بنەمای خەملاندنێکی قوول لەبارەی پێگەی دارایی حکوومەتەکانی نێوەندو ویلایەتەکان‌و هەروەها پرس‌و ڕاگۆڕینەوەی فرەوان لەگەڵ خاوەن پیشەکاندا سەرچاوە دەگرن.

ڕێژەیەکی سەدیی دیاریکراو لە سەرجەم باج‌و گومرگەکانی نێوەند بۆ ویلایەتەکان تەرخانکراوە. کاتی حسابکردنی پشکی گومرگ‌و باجەکانی ناوەندیی‌و بەخشیش‌و یارمەتییەکان بە مەبەستی لێدەرهێنانی بەشی ویلایەتەکان. کۆمیسۆنەکە ڕێژەی هەناردەکان لە نێوەندەوە بۆ ویلایەتەکان ڕەچاو دەکات‌و، ڕاسپاردەکانی خۆی ڕادەگەیەنێت ئەوەش لەسەر بنەمای گریمانەی ئەوەوە کە سپاردن‌و پێدانی باج‌و بەخشەکان لە نێوەندەوە بۆ ویلایەتەکان نابێ لە ٣٧,٥٪ لەسەدای سەرجەمی داهاتەکانی نێوەند لە

باج و گومرگ و بواردکانی دیکەوە تێپەڕ بکات. سالّی ٢٠٠٢ دوانزدەمین (کۆمیسۆنی دوانزەهەمی دارایی) دامەزرێنراو، وای بۆ دانرابوو کە راپۆرتی خۆی لە مانگی حوزەیرانی ٢٠٠٤دا پێشکەش بکات و ئەم راپۆرتەش دەبووا بۆ ماوەی نێوان ٢٠٠٥- ٢٠٠٦ تا ٢٠١٠- ٢٠١١ کاری پێبکرێت.

کۆمیسیۆنی پلاندانان لە نێوەندو ئەنجومەنە ئۆتۆنۆمییەکان لە ویلایەتەکاندا ئامرازی زۆر گرنگی پێوەندییەکانی نێوان نێوەندو ویلایەتەکانن.

کاتێ هیندستان سەربەخۆیی بەدەستهێنا، نەخشەدانان بووە ئەرکێکی بنەڕەتیی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی (هەژاریی، نەخوێندەواریی، نەبوونی و کەمیی خۆراک و، هەروەها دواکەوتوویی پیشەسازی).

لەمانگی ئاداری ١٩٥١دا کۆمیسۆنی نەخشەسازیی بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی پلاندانان پێکهێنراو، دواتریش نەخشەکانی سالآنەو پێنج سالّی دارێژران و بە ئابوورییەك ئەنجامدراون کە تیایدا رۆلێکی زۆرتر بۆ کەرتی گشتیی و رۆلێکی کەمتر بۆ سێکتەری (کەرت) تایبەتی سەر بە ویلایەتەکان تەرخانکرابوو.

پرۆژە سەرەکییەکان و بەرنامەکان (پرۆگرامەکان) پێویست بوو لەلایەن کۆمیسۆنەکەی پلاندانانەوە پەسەندبکرێن بەر لەوەی هیچ ماددەیەکی

بودجە بۆ خەرجییەکانی دابنرێن یان بڕیاریـان لەسـەر بـدرێت. بڕیـاردان‌و بڕینەوەی یارمەتیی بۆ ویلایەتەکان سەرەکی ترین کاری کۆمیسۆنەکەیە.

جا، بەهۆی ئەوەوە کە سەرچـاوەکانی پلانـە گـشتییەکان سـنووردارن، هەروەها نایەکسانیی لە دابەشبوونی سەرچـاوەکان لـەنێوان ویلایەتەکانـدا هەیە، بەشداربوون لە سەرچـاوەکان هەمیـشە وەك هۆکـارێکی نـاکۆکیی‌و ڕێکنەکەوتن دەمێنێتەوە لە پێوەندییە فیدرالییەکاندا.

### ٤. هێزە بزوێنەرەکانی رامیاریی سەردەم

کورتهێنانـــە ســـەرەکییەکەی دەســـتوور لـــەوەدابووە کـــە نـــەیتوانیوە حوکمڕانییـــەکی یـــەکگرتوو بێنێتـــە ئـــاراوە کـــە لـــەژێر ســـایەی دەسـتە هەڵبـژێردراوەکان لـە گونـدو شارۆچـکەکاندا بـۆ (ناوەنـد) کـار بکـات. ڕاستییەکەی ئەوەبوو کە بە گەڕان بەدوای پاکانەو پاسـاوی پێویـستدا بـۆ هێشتنەوەی هیندستان بە یەکگرتوویی، ژمارەیك لـە بڕگـەو ماددەکـانی دەستوور سەراوژێرکران. دەرەنجام هیند لە سـاڵەکانی هەشـتاکانی سـەدەی ڕابـردوودا (بیـستەم) رووبـەڕووی کێـشەگەلی (توندوتیـژیی، مەترسـیی‌و هەڕەشەی جیابوونەوە، خودموختـاریی، چـارەی خۆنووسـین، گۆڕانکـاریی رادیکـاڵی (بنـەڕەتی) دەسـەڵاتەکانی بـۆ ویلایەتـەکانی بـووەوە. بـە لەبەرچاوگرتنی فرەیی‌و هەمە جۆریی کۆمەلایەتیی هیندستان، پرەنـسیپی فیدرالیزم تاکە بناغەی خۆڕاگریی‌و بەردەوامبوونە کە بۆ دەستەبەرکردنی دەوڵـەتێکی یـەکگرتووی بـەهێزی هینـد دەسـتبدات. هـەر تـەنیا بـە

دەولـەتێکی شـێوە فیـدرالیی دەکرێـت هەمـە جـۆریی‌و پەرشـوبلاَویی کـەلتووریی- کۆمەلاَیـەتی ولاَت بەگـشتی‌و ویلایەتـەکانی بەتایبـەتی بەیەکەوە ببەسترێنەوەو رابگیرێن.

هیند گەیشتبووە خالێکەوە ئەگەر راستییە کۆمەلاَیەتی‌و رامیارییەکان لەسـەر ئاسـتە جوداوازەکـان رەچـاو نـەکرابان ئـەوا (یەکێتییەکـە)ی خـۆی نەدەگرت‌و لەنێو دەچوو. بۆیەکا، گەڕان بەدوای رێوشوێنی دەستووریی بـۆ چاککردن‌و بەرەوپێش بردنی سیستمی فیدرالیی بووەتـە ئەجینـداو خـالی هەرە سـەرەکیی لـە کارنامـەی رۆنـاکبیرو یاسـاسـازان‌و حزبـە سیاسـییە پێوەندیدارەکاندا.

لـە سـالەکانی دوای هەشـتاکاندا زانـرا کـە بلاَوبوونـەوەی بیرۆکـەی فیـدرالیزم خـۆی سـەپاندووە بەسـەر (مەرکوزییـەت)دا لەسـەر ئاسـتە ئاسەرەکییەکانی دەولەتییدا. هەر بۆیەش حکومەتی یەکێتی (ناوەنـد) لـە حوزەیرانی سالی ١٩٨٣دا کۆمیسۆنێکی دامەزراند بەنێوی (کۆمیـسیۆنی سـەرکاریا) (Sarkaria Commission)، بـە مەبەسـتی پێداچـوونەوە بـە رێکخستنەکانی نێوان (یەکێتی)یەکـەو ویلایەتـەکان، بـە لەبەرچـاوگرتنی دەسـەلاَتەکان‌و ئـەرکو بەرپرسـیاریەتییەکان لـە سـەرجەم بوارەکانـداو، هەروەها بۆ دۆزینەوەو راسپاردنی پێوەرگەلی گونجاو بۆیان.

ئـەو راپۆرتـەی لـە کـانوونی دووەمـی ١٩٨٨دا وەرگـیرا هـیچ گۆڕانکارییـەکی رادیکـالیی (بنـەڕەتیی) لـە پێوەندییەکانـدا پێـشکەش

نەکردبوو، بگرە لەگەڵ چوارچێوەی فیدرالییە دوو- ئاستەکەدا مابووەوە. (کۆمیسیۆنە سەرکارییەکە) ڕەخنەی گرت لەو مەیلی گشتییەی لاگیری چڕکردنەوەی دەسەڵاتەکان بوو لە (مەرکەز)داو، لەنێوان شتهای تردا کەمکردنەوەی ئەو نەخشەسازییانەی پەسەندکرد کە لەلایەن مەڵبەندەوە (نێوەند)ەوە سەرپەرشتیی و چاودێرییدەکران و تایبەتن بە کایە گرانبەهاکانی ویلایەتەکان سەبارەت بە بابەتگەلی سەر بە یەکێتی لەنێو (لیستی هاوبەش)دا. هەروەکو ڕاپۆرتەکە تێبینی بەسوودی نیشاندا لەمەڕ پێویستبوونی گواستنەوەی هێزو دەسەڵات بۆ خوار ئاستی ویلایەتەکان بۆ دەستە هەڵبژێردراوە ناوچەییەکان، کەچی ئەمانە وەك فیدرالیزمیی هەمە ئاست کورتیان هێنا، لەوانەیە بزاڤی ڕووەو فیدرالیی فرە ئاست لە ناوەندی هەشتاکاندا گرنگترین هەنگاوەکانی فیدرالیزمیی هیندی بووبێت لەم ساڵانەی دواییەدا.

پێشتری هەوڵی مێژوویی بەئاراستەی دروستکردنی ڕایەڵی نزمتری حکومەت دراوە، وەلێ، ڕووکارگەلە تازەکان دیموکراتیترو پەسەندو جێگیرتربوون.

ئەو ڕاستییەی کە ئەنجومەنەکانی گوندەکان (پانچایات)و هەروەها شارەوانییەکان هیچ پێگەیەکی دەستوورییان نەبووە، ڕێگربووە نەك هەر لەبەردەم ئەشونماکردن و پەرەسەندنیان، بەڵکو لەبەردەم دابەشبوونی دەسەڵاتە ناوەندییەکانیشیدا.

دەستوورەکە بەتەنیا دان بە (یەکێتیو ویلایەتەکان)دا دەنێت، وەلێ، لەسەرەتای هەشتاکاندا گفتوگۆ لەمەڕ پێدانی ڕەوایەتیی قانوونییو دەستووریی بە دەستە ناوچەییەکانیش دەستی پێکردبوو. تاقیکردنەوەکان لە (بەنگالی خۆرئاوا) ١٩٧٨و (کارنەتاکا ١٩٨٧)و، هەروەها لە (ئەندراپرادیش ١٩٨٧)دا وەڵامدانەوەی زۆر نائاسایی دانیشتووانانیان لێکەوتەوە. لەڕۆژی ١٥ی ئایاری ١٩٨٩دا پڕۆژە یاسایەك- شەستوچوارەمین هەموارکردن) لەلایەن سەرەك وەزیرانی ئەوساوە (ڕاژیف گاندی Rajiv Gandhi) درایە پەرلەمان تا (پانچایاتەکان) بێنێتەوە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی دەستووردوە. ئەم هەنگاوە پێشوازیی لێکرا، بەڵام، ڕووبەڕووی بەرهەڵستییەکی زۆر توونددیش بوویەوە، ئەوەش لەسەر دوو بنەما:

١- پڕۆژەکە چاودێرییو چاوپۆشیی لە ویلایەتەکان دەکرد بۆیەکا وەکو ئامرازێکی (نێوەند) بۆ مامەڵەکردنی ڕاستەوخۆ لەتەك (پانچایاتەکاندا) سەیر دەکرا.

٢- نموونەیەکی وەکیەکیی (نموزج موحد) بەسەر سەرتاپای وڵاتدا دەسەپاند لەجیاتی ئەوەی ماوەبدات بە ویلایەتە تایبەتییەکان هەتا ووردەکارییەکانی یاسا بەگوێرەی ڕەوشو بارودۆخە ناوچەییەکانیان دابڕێژن.

هەروەکو لەدەردوەی پەرلەمانیشەوە لەلایەن پارتە سیاسییەکانو رۆشنبیرانو هاوولاّتییە پێوەندیدارەکانەوە بانگەوازی بەرهەلّستیکردنی پرۆژەکە بەرزکرایەوە. هەرچەندە پرۆژەکە لە ١٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٩ لە (لۆك سابهاو راجیا سابها)دا زۆرینەی ٣/٢ دوو لەسەر سێی دەنگەکانی بەدەستهێنا، بەلاّم بەدوو دەنگ دۆڕاو پەسەند نەکرا. لەسەر ئاستێکی تر، لەوانەیە بە راگەیاندنو بانگەشەی فرەوانتربووبێ بۆ فیدرالییەتی هەمە ئاستەوە کە ژمارەیەك ئەنجومەن پێکهێنرابوون، لەوانە (ئەنجومەنی دارجیلینگ گۆرها هیل) (Darjeeling Gorkha Hill) ١٩٨٨، (ئەنجومەنی ئۆتۆنۆمیی بۆدۆلاند) (Bodoland Autonomous Council) ١٩٩٣، ئەنجومەنی خودموختاری دەڤەری ژهارهاند ( Jharkhand Area Autonomous Council) ١٩٩٤، هەروەها (ئەنجومەنی خودموختاریی هیل دیستریکت بۆ لاداخ (Autonomous Hill District Couneil for Ladakh) سالّی ١٩٩٥. ئەمانە هەموو یەکەی (لامەرکەزیی) نوێ بوون کە واتاو گۆڕوتینی زۆرترینیان بە سیستمی (فیدرالیزمی فرەئاست) بەخشییو، هەروەکو هاندەرو پالّپشتگرتنێك بوون بۆ رێکخستنی دامودەزگاکانی توێژە فرەو جوداوازەکان لەنێو چوارچێوە فیدرالییەکەی هیندیدا.

لە ئەیلوولی ١٩٩١دا حکومەتی کۆنگریس بە سەرۆکایەتی (ناراسیماراو) (Narasimha Rao) دوو پرۆژە یاسای پێشکەش کرد- یەکێکیان بۆ دەستەو ئەنجومەنەکانی دیهات (پانچایاتەکان)و ئەویتریان بۆ

کۆمەڵەو ئەنجومەنە ناوخۆیەکانی شار (شارەوانییەکان) بە مەبەستی فرەوانکردنی بەشداربوونی دیموکراسییانەی گوندەکانو شارەوانییەکان.

ئەم پرۆژە یاسایانە لە ٢٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٢دا لە پەرلەمان دەرچوێنرانو ساڵی ١٩٩٣ دوابەدوای نزیکەی ١٠دە ساڵ گەنگەشەو گفتوگۆو بینەوبەرەو بزاڤی یاسایی لەسەر جۆرەها ئاستی جیاواز وەك (گۆڕینو دەستکاریکردنی حەفتاو سێهەمو حەفتاو چوارەم) خرانە بەرکارەوە. بەم هەموارکردنانە ٤٧ چڵو حەوت بابەت لەلایەن ویلایەتەکانەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی پانچاکاتەکانو شارەوانییەکان گوێزرانەوە.

گۆڕانکارییەکان دەڤەرەکانی هۆزەکانیشی گرتەوە (بەشی خشتەی پێنجەم لە دەستوورەکە) کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٦. ئەم هەموارکردنە دەستوورییە مێژووییانە گوزارشت بوون لە ژمارییەك گۆڕانکاریی.

یەکەم: پانچایاتەکانو شارەوانییەکان بوون بە پەیمانگەگەلی خۆبەڕێوەبردن نەك تەنها ئاژانسگەلی پەرەسەندن.

دووەم: ئەنجومەنەکانی گوند (Gram Sabhas)و کۆمیتەکانی پاراستن لە شارەوانییەکاندا بوونە یەکەگەلی بنچینەیی بۆ سیستمی دیموکراتیی.

سێهەم: هەموارکردنەکان چەندان پلەو ئاستی تازەیان لە سیستمەکەدا هێنایە ئاراوە- سیستمی پانچایاتەکان لە ٣ سێ ئاست پێکهاتبوو: لە

نزمترین ئاستدا گوند بوو. لە ئاستی ناوەندیدا (بلۆك) بـوو، لـە سـەردوەی هەموانیشەوە ناوچە · (هەرێم) دەهات.

چوارەم: چاکسازییەکان بناغـەی دیموکراسـییان لەووڵاتـدا فرەوانکـرد- کورسییەکان لە پانچایاتەکانو شارەوانییەکاندا لەهەر سـێ ئاسـتەکانیاندا دەبووا ئێستێ بە هەڵبژاردنی راستەوخۆ بۆ ماوەی پێنج ساڵان پڕبکرێتەوە، هەروەها چەندان کورسی هەڵگیراون بۆ ئەو گرووپانەی هـەتاکو ئێـستا لـە دەرەوەی پرۆسەکەدان، وەك هۆزەکـانو خـەڵکانی سـەر بـە توێـژە ئاسـت نزمەکانەوەو ژنانیش.

پێنجەم: کۆمیسۆنێکی سەربەخۆی تایبەت بـە هەڵبژاردنـەکان لەهـەر ویلایەتێکـدا پێکهێنـرا بـۆ سەرپەرشـتیو رێنمـاییکردنو کـۆنترۆلکردنی پرۆســەی هەڵبژاردنــەکانو ئامــادەکردنی لیــستەکانی تایبــەت بــە هەڵبژاردنەکانو کۆمیسۆنەکانی دارایی سەر بە ویلایەتەکان.

شەشەم: گۆڕانکارییەکان بڕیاریان لەسەر ئەو پرەنـسیپانەدا کـە دەبـووا سەرچاوە داراییەکان بەبێ زیادوکەم بگوێزرێنەوە بـۆ سـەر پانـچایاتەکانو شـارەوانییەکانو، هـەروەها کۆمیتەگـەلی نەخشەکێـشانی هەرێمـەکانیان دامەزراندن. بەخششی خکومەتەکانی هەریەك لە (نێوەنـد)و ویلایەتـەکان سەرچـاوەیەکی گـرنگو بـەهاداری داراییـن، بـەڵام چـاوەڕواندەکرێت حکومەتەکانی ویلایەتەکانیش داهاتی هەندێك باجو گـومرگی دیـاریکراو بـۆ (پانـچایاتەکان) بگەڕێننـەوە. لـە هەنـدێ حاڵەتانیـشدا رێگـە بـە

پانچایاتەکان درابوو باجی خۆجێیی کۆبکەنەوەو داهاتەکەی بۆ ناوچەکەی خۆیان بەکاربێنن. لەئەنجامی ئەو چاکسازییە دەستووریانەوە چینێك لە حکومڕانیی دیفاکتۆ (ئەمری واقیع) بە بنەمایەکی دیموکراسی فرەوان هاتە ناوەوە. پێش ئەمە هیند نزیکەی ٤٩٦٣ ئەندامی هەڵبـژێردراوی لە پەرلەمانو ئەنجومەنەکانی ویلایەتەکاندا هەبوو، وەلێ، لە ئێستادا هەر پێنج ساڵ جارێك ٣سێ ملیۆن نوێنەر دێنە هەڵبژاردن. کە زیاتر لە یەك ملیۆنیان ئافرەتن. ژمارەیکی زۆریش لە گرووپو کۆمەڵە بەشدارنەبوودکانی پێشوو ئەمێستاکە خراونەتەوە ناو دەزگا بڕیار بەدەستەکانەوە. هیندستان لە فیدرالییەکی دوو ئاستییەوە (یەکێتیو ویلایەتەکان) رووەو فیدرالیزمێکی فرە ئاستی خاوەن دامودەزگەی خۆجێییەتی (پانچایاتو شارەوانییەکان) لەسەر ئاستی هەرێمو نزمتریش کە بوویەتە سێهەم ئاست- هەنگاو دەنێت.

هەندێ لە راڤەکاران پێیانوایە ئەم پرۆسەیە تەنیا (فیدرالیزمی ئیدرایی) بەهێز دەکاتو هیچی تر، بەو مەبەستەی یارمەتی نوێنەرانی دەسەڵاتە داراییو کارگێڕییەکان بداتو لە ویلایەتەوە، بیانداتەوە بە دەزگەو دامەزراوە خۆجێییەکان. دەسەڵاتی کارگێڕیو سەرچاوە داراییەکانی دامودەزگە خۆجێییەکان بۆ پیادەکردنی ئەم دەسەڵاتانەیان پشت بە رێگەی یاسادانانەوە دەبەستن کە دەبێ لەلایەن ویلایەتەوە

دەربچوێنرێن. ئەمان خۆیان هیچ دەسەلاتێکی جێبەجێکردنو یاسازییو دارایی، یان دادوەریی دیاریکراویان نییە.

لەبەر ئەمە، بەپێی ئەم قوتابخانەیەوە، پێگەی دەستووریی هەلبژاردنەکانیش ئەو مانایە نابەخشن کە ئەمان سێهەم چین (پلە)ی حوکمرانیی بن. ئەمە بەهەرحال دیدو بۆچوونێکی سنوورداره لەهەمبەر ئەو گۆرانکارییە دیموکراتییو سیاسیانەدا کە بەدیهاتوون.

خەلکانی تر پێیانوایە ئەم تێروانینو رێبازە گۆرانکارییەکی چلۆنایەتی لە کارەکتەری فیدرالیزمی لەشێوازی فەرمانرەویی هیندیدا دەگەیەنێت. هەر یەکێك لە ویلایەتەکان بووەتە یەکەیەکی فیدرالیی کە سێ چین لە خوارە خۆیدا هەنە: ناوچە، بلۆكو گوند.

ئەمەش جۆرە فیدرالیزمێکی بێ وێنەو تاکەو، هیند پێویستە کۆشش بکات بۆ هاوسەنگییەکی گونجاو، هەروەها رایەلو پێوەندیی دروست بکات لە پرۆسەیەکی دیموکراسییانەدا، لە (گرام سابها- ئەنجوومەنی گوند)ەوە بۆ (لۆك سابها) لە پەرلەمانی فیدرالییدا، ئەو رێوشوێنە فرە ئاستانە لە هیند گوزارشت لە نیشانەی گەرانی نوێو بەردەوام بەدوای شێوازی تازەدا دەکەن کە گونجاو بێت لەهەمبەر ئەو فشارانەی لە ئەنجامی پەرەئەستاندنی دیموکراسییەوە دروستبوون.

بۆ ئەوەی فیدرالیزمی هەمەئاست کاریگەریی ببێت، لەسەر نێوەند پێویستە سۆزو خواستێك پەرەپێبدات بۆ بەشدرایی پێکردنی ویلایەتەکان

لە دەسەڵاتەکاندا بەشێوەیەکی یەکسان. داهێنانو تازەکردنەوەی نەریتی ئامۆژگاریی‌و کۆمەلایەتی مەرجی پێویستن بۆ پتەوکردنی چوارچێوەی فیدرالی. شێوەی حوکمی فیدرالیی هیندستان نەگۆڕو جێگیر نییە. وەك (رەشیدخان)ی شارەزاو پسپۆڕ لە فیدرالیزمی هیندیی وای بۆدەچێت (گەلی هیند خاوەن فیدرالییەتێکە وورده وورده پەرەدەسێنێت. هیند وەك (گەل)ێك نیوسەدەی تێپەڕاندووەو لەتەك ئەو رەوتەیەشدا بەپێی ئەمری واقیع (دیفاکتۆ) پێی ناوەتە نێو بازنەی فیدراڵییەتێکی فرەناستەوە، ئەوەیش گۆڕانێکە جوداوازە لەوەی کە تەنها (یەکێتییەکی چەند ویلایەتێك) بێت.

ئەوەیش گرنگە تێبینی رەوتێکی دیاری دیکەی فیدرالیزمی هیندی بکەین- سیستمی هەمیشە لە گۆڕانیی حزبی سیاسی. ئەوەبوو هەتا هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان لەساڵی ١٩٧٧دا، (حزبی کۆنگرێس) دەستی بەسەر گۆڕەپانی سیاسیی هیندستان داگرتبوو. لەگەڵ ئەوەشەوە، لەو کاتەوەدا چەندان حزبی هاوپەیمانی تر پەیدابوون تا بێننەوە، نەك تەنها لە (نێوەند) بگرە لە ویلایەتەکانیشدا.

ئاوەها، لە ئیمڕۆدا، تەنانەت (پارتی کۆنگرە)یش ناتوانێ دەسەڵاتەکان بەتەنیا بۆ خۆی قۆرغ بکات، بەڵکو لەسەری پێویستە داوای پشتگیریی‌و هاوکاریی لە حزبەکانی هەرێمەکان بکات تاوەکو لە دەسەڵاتدا بمێنێتەوە. (حکومەتی ئێستای هیند لە هاوپەیمانیی ٢٤ حزب پێکهاتووە).

(مەبەست ساڵی نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیە، وەرگێڕ- مەجید ئاینگەر) ئێستێ لە هیندستان پتر لە (٥٥٠) حزبی سیاسیی تۆمارکراو هەنە، کە لەنێوانیاندا بە تەنیا (٦) شەشیان وەك حزبی نەتەوەیی (سەرانسەریی) دەژمێردرێن، ٤٠ چلیان لەسەر ئاستی ویلایەتەکانن‌و (٥٠٤) یش تەنیا پێگەی خۆجێیەتی (ناوخۆیی)یان هەیە. پارتیە هەرێمایەتییەکان یان ویلایەتییەکان کاریگەریی دیاریان لەسەر (نێوەند) هەیەو بەم پێیە بەهەند هەڵگرتنی (نێوەند) تا رادەیەکی زۆر زیادی کردووە، هەر کاتێ حزبێك (یان چەند حزبێك)ی دیارو بەهێز کە هاوبەندییەکی فەرمانڕەوایان پێکهێناوە، لەسەر هەندێ بابەتی سیاسی یان بەرژەوەندیی هەرێم یان ویلایەتەوە، پشتگیریی خۆیان بکێشنەوە ئەو وەختە حکومەتی (نێوەند) توانای مانەوەی نامێنێت.

هەندێ چاکسازیی رامیاریی‌و دەستووریی لەماوەی (٣) سێ ساڵی رابردوودا کاریگەریی دیاریان بەسەر شێوازی فەرمانڕەوایی هیندا جێهێڵاوە. یەکەمین چاکسازیی گرنگ ئەو هەموارکردنە دەستوورییانەی کە لە ساڵەکانی دەستپێکی سەدەی بیستیەکەمدا جێبەجێکراون. دوابەدوای هەشتایەمین هەموارکردنی دەستوور ساڵی (٢٠٠٠)، سەرجەم داهاتەکانی یەکێتییەکە ئێستا دەکرێ لەگەڵ ویلایەتەکان دابەش بکرێت. هەموارکردنی ژمارە (٨٤) هەشتاو چواری دەستوور ساڵی (٢٠٠٢) دیاریکردنی سنووری بۆ دەنگدەرانی ناوچەکانی هەڵبژاردنی پارلەمانی

هەتا ساڵی (٢٠٢٦) هەڵپەساردووە. پاساوی ئەم هەموارکردنەش ئەوەبوو ئەگەر سنووردانانەکان هەر لەساڵی (٢٠٠١)ەوە پیادەبکرابوایە ئەوە دەبووا ئەو ویلایەتانەی باشوور کە لە پێداچوونەوە بە زیادبوونی ژمارەی دانیشتووانانیان سەرکەوتوو بوون، بەناهەق سزا بدرانایا. ویلایەتە هیندی زمانەکان لە باکوور کە چڕیەکی زۆری دانیشتوانانیان هەنە، بەم شێوەیە دەرفەتی زیادکردنی هێزو تواناى پەرلەمانییان لەدەستداوە.

هەموارکردنێکی بایەخداری دیکە لە یاسای (هەموارکردنی نوێنەرایەتی کردنی خەڵك) دابوو کە ساڵی ٢٠٠٣ دەرچووەو، سیستمێکی کراوەی پێشکەش کردووە بۆ شێوەی دەنگدانو لیستەکانی پاڵێوراوان لە هەڵبژاردنەکان بۆ (راجیا سابها- ئەنجوومەنی باڵا)و، مەرجەکانی دیکەیشی بۆ نارەزایی دەربڕینو بەربەرەکانێی هەڵبژاردنەکان بۆ ئەو ئەنجومەنە وەلاناوە. ئەندامانی راجیا سابها لەلایەن ئەندامانی ئەنجومەنەکانی یاسادانانی ویلایەتەکانەوە هەڵدەبژێردرێن. بەپێی مەرجەکانی پێشتر، دەبووا کاندیدکراو بۆ راجیاسابهای ویلایەتێکی تایبەت خەڵكو دانیشتووی هەمان ویلایەت بووایە: مەرجە تازەکان ڕێگە دەدەن کە دانیشتووێکی هەر ویلایەتێ بۆی هەیە هەڵبژێردرێت بۆ راجیاسابها لەهەر ویلایەتێکی دیکەی (هیند)دا. دەشگوترا کە ئەم گۆڕانکارییە کار لە خودی بناغەی بنیادنانی فیدرالییەتەکە دەکات.

(کۆمیسۆنی نەتەوەیی بۆ چاودێریکردنی دەستوور) لە شوباتی ٢٠٠٠ دامەزرێنراو لە کۆتایی ٢٠٠٢دا راپۆرتی خۆی بلاوکردەوەو تیایدا زۆر بە دوورو درێژی رێناییگەلی دەربارەی بنیادو پێکهێنانی حکومەت لە مەلبەند (نێوەند)و لە ویلایەتەکانداو هەروەها لەمەڕ پێوەندییە هاوکۆییەکانی نێوان حکومەتە ناوخۆییەکانەوە دەرکردبوو.

کۆمیسۆنەکە داوای چاکسازیی گشتگیری لە سیستمی کۆمیتەکاندا کردووە بەشێوەیەك کۆسپو ئاستەنگەکانی بەردەم پەرلەمانو ئەنجوومەنەکانی یاسادانان لە ویلایەتەکاندا نەهێلێت. کۆمیسیۆن پێشنیاری پێکهێنانی سێ کۆمیتەی تازەی کردبوو (بە هەلوەشاندنەوەی هەندێ لە کۆمیتەکانی ئەو سەردەمە، ئەوانەی تایبەت بوون بە مولكو خانووبەرە (عقارات)، خزمەتگوزارییە گشتییەکانو ئەنجومەنە پاشکۆییەکانی یاسادانان، ئەوانەی داوایکردبوون بریتی بون لە (کۆمیتەیەکی دەستوور- پەیوەست بە چاکسازییەکان-، کۆمیتەیەك بۆ ئابووریی نەتەوەیی، کۆمیتەیەکیش بۆ یاسادانان).

سەبارەت بە پێوەندییەکانی نێوەندو ویلایەتەکانەوە، کۆمیسیۆنەکە ئامۆژگاریی بەهێزکردنی (ئەنجومەنەکەی ئێستای نێوەندو ویلایەتەکانی) کرد ئەمەش هەماهەنگە لەگەڵ گیانی فیدرالیزمی هاوکاردا کە پێویستی هەیە بە لەیەك گەیشتنی تایبەتیو متمانەی دوو لایەنەو چارەسەرکردنی بێ دواخستنو بەپەلەی ئەو کێشانەی سەر بە بەرژەوندیی گشتیین.

هەروەکو پێکهێنانی (کۆمیسۆنێکی بۆ رێکخستنی بازرگانیی (نێوان ویلایەتەکان) بە پەسەند زانیوە، (ماددەی ٣٠٧، دەروازەی ٤٢، لە لیستی یەکێتی دا) ماددەی ٣٠٧ ئاماژە بە دامەزراندنی دەسەلات دەکات لەلایەن پەرلەمانەوە بۆ ئەنجامدانی بازرگانییو ئالۆگۆڕکردنو چالاکییە پێوەندیدارەکانی تر لەنێو سنووری هیندستاندا- واتا ئازادیی ئالۆگۆڕکردنو قەدەغەکردنیان لە ناوەوەی ولاتدا لەنێوان ویلایەتەکانیشدا.

کەچی دەروازەی ٤٢ لە (لیستی یەکێتی)دا ئاماژە بۆ بازرگانییو گۆڕینەوەی شتومەك لەنێوان ویلایەتەکاندا دەکات.

پێشنیارێکی پێشوازیلێکراوی دیکە ئەوەبوو کە (بەر لە ئیمزاکردنی هەر رێککەوتننامەیەکی نێودەولەتیی کە کاریگەریی بنەڕەتیی زۆر گرنگی لەسەر بەرژەوەندییەکانی ویلایەتەکاندا هەبێت لەمەڕ ئەو بابەتانەی لەسەر لیستی ویلایەتدان، دەبووا حکوومەتی یەکێتی پێشەکی پرس‌ورا گۆڕینەوە لەگەڵ (ئەنجومەنەکەی نێوان ویلایەتەکان)دا بکات.

دەبێ لێرەدا تێبینی ئەوەش بکرێت کە ئێستێ دوو حالەت هەنە لە (دادگەی بالای هینددا) لە چاوەڕوانییدان لەلایەن حکومەتەکانی ویلایەتەکانی (پونجابو تامیل نادۆ)وە پێشکەش کراون بۆ نارەزایی دەربرین لە ئیمزاکردنی یەکلایەنەی رێککەوتننامەی رێکخراوەی بازرگانیی نێودەولەتیی لەلایەن حکومەتی (ناوەندیی یەکێتییەوە) لەساڵی ١٩٩٥ دا.

لــەماوەی دوو کۆبوونــەوەی ئەنجومــەنی نێــوان ویلایەتەکانــدا مــانگی تەشــرینیی دووهــەمی ٢٠٠١و ئــابی ٢٠٠٣، ویلایەتــەکان دەســتکەوتی زۆریان بەدەستهێنا. لەسـەر ئـەوە رێککـەوتن کـە دەسـەڵاتە زیادەکـان ئەوانەی پێشتر بۆ حکومەتی (نێوەند) مابوونــەوە بـۆ (لیـستی هاوبـەش) بگوێزرێنەوەو، هەروەها بەیاساکردنی ئـەم لیـستەیش بـە پـرس‌و راکـردن لەگەڵ حکومەتەکانی ویلایەتەکان دابێت.

راسپاردەیەکی گرنگـی دیکـەش کـە ئەنجومــەنی نێـوان ویلایەتــەکان قەبوولی کرد ئەوەبوو حکومەتی نێوەند دەبووا بۆ دامەزراندنی پارێزگاکان پرس بە سـەرەك وەزیـری ویلایەتەکـەوە بکـات‌و، حکومــەتی نێوەنـدیش بەڵێنی داوە بەو پێیە دەستوورەکە هەموار بکات.

هــەروەها کۆبوونەوەکــەی (ســرینگار Sringar)ی ئەنجومــەنی نێــوان ویلایەتەکان لەبارەی (ماددەو مەرجەکانی) حاڵەتی لـەناکاو (تـەواریی)ی سەر بە ماددەی (٣٥٦) گفتوگۆی کردو چەند برِیـارێکی دیـاریکراوی لـە سوودو بەرژەوەنیی ویلایەتەکان دەرکردو بەهۆیانــەوە ســنوورێك دانــرا بــۆ خواســت‌و ئــارەزووە نارەواکــانی حکومــەتی یــەکێتی (یــەکگرتوو) بــە لەبەرچاوگرتنی دیاریکردن‌و جاردانی باری تەنگانەو ناکاویی.

لەبارەی جەنگ دژی تیرۆریزمەوە، مافی بەکارهێنانی هێزی تایبەتی لە ویلایەتێکـدا کـاتی ســەرهەڵدانی حاڵـەتێکی تەنگانــەو ناکاوییـدا وەکــو مافێکی تایبەت بە حکومەتی نێوەند (یەکێتی یەکە) سەلمێنرا.

بەڵام، لەبارەکانییتردا پرس‌و راوێژکردن لەگەڵ ویلایەتەکاندا بە پەسەند زانرا. هەروەکو هێنانە ئاراوەی سیستمێك بـۆ ئـاڵوگۆڕکردنی ئەفـسەرانی هێزە چەکدارەکانی پۆلیس لەنێوان یەکێتی‌و ویلایەتەکاندا پەسەندکرابوو.

ئەنجومەنەکەی نێوان ویلایەتەکان لەکۆی ٢٤٧ راسپاردەکانی (کۆمیسیۆنی سارکاریا)وە (٢٣٠) یانی پەسەندکردنو (١٧٠) شیان هەر پێشتر کاریان پێکرابوون.

ئەنجومەنەکە لە دوایین کۆبوونەوەیدا بڕیاریدا کە ئیتر لەوەودوا ببێتە کۆڕو دوانگەیەك بۆ دەستنیشانکردنی مەسەلە بایەخدارەکانی پەیوەست بە فیدرالیزمی هەرەوەزیی (هاوکاریکار)و گرنگیدان بە چاپەمەنییو پەخشو بلاّوکردنەوەی چەمکە کۆمەلایەتییو ئابوورییەکانی. کاروچالاکییەکانی ئەنجومەنەکە ( ISC) ئەو پانتاییە روو لە فرەوانبوونە کە لە ئێستادا ویلایەتەکان لە بونیادی فیدرالیزمدا وەدەستیانهێناوە عەکس دەکاتەوە.

پرۆسەی بە فیدرالیبوون لە هیندستاندا گۆڕو تەووژم بەخۆوە دەگرێت. یاریزانە سەرەکییەکانی پرۆسەکەش بریتین لە (سەرەك کۆماری هیندستان، دادگەی بالاّ، کۆمیسیۆنی مەلبەندیی هەلّبژاردنەکانو کۆمیسیۆنی نەتەوەیی بۆ مافەکانی مرۆڤ، وەهەروەها رێکخراوەکانی کۆمەلّگەی چالاكو زیندووی هیندستانو راگەیاندن- میدیا- بەهەمان شێوە یاریکەری سەرەکییو کاریگەرن لە پرۆسەکەدا. هیچ ساتێکی سستوخاو- ناخۆشو بێ ئومێدیی لە گۆمەلّگەی هیندستاندا بوونی نییەو، سرووشتی زبرو (توندی) سیاسەتە هەمیشە لە گۆڕانکارییەکانی هیند تەنیاو تەنیا ویلایەتەکانی بەهێزترو کۆتوبەندە گورچکبڕەکانی (نێوەند) یان لاوازو بێ هێزتر کردووە.

## خشتەی ژمارە (١)

## هێما رامیاریی و جێوگرافییەکان:

| | |
|---|---|
| شاری پایتەخت | نیودەلهی |
| ژمارەو جۆری یەکە پێکهێنەرەکان | ٢٨ ویلایەتن: ئەندراپرادیش. ناردوناخال پرادیش. ئاسام. بیهار چهاتیسگار. گۆوا. گوجارات. هاریانا. هیماچال پرادیش. جامۆوکشمیر. جهارخاند. کارناتاکا. کەرالا. مادیا پرادیش. مەهاراشترا. مانیپور. مەگهالایا. میزۆوارم. ناگالاند. ئۆریسا. پونچاب. راجاستهان. سککیم. تامیل نادو. تریپورا. نوتارانچال. ئۆتار پرادیش. بەنگالی خۆرئاوا. ٧حەوت یەکێتی ناوچەیی: دوورگەکانی ئەندامانو نیکۆبار. چاندیگار. دادراو ناگار هاڤەلی. دامانو دایو. لاکشادویب. پۆندیچاریو دەلهی. |
| زمانە فەرمییەکان | ئاسامیی. بەنگالی. گوجاراتی. هیندیی کانادا. کشمیریی. کۆنکانیی. مالایالام. مانیپوری. مارادی. نیپالی. ئۆرییا. پونجابی. سانسکریتیی. سندی. تامیل. تەلوگو. ئوردو. |
| رووبەر | ٣٢٨٧٥٩٠ کیلۆمەتری دووجا. |
| رووبەر - فرەوانترین یەکەی پێکهێنەر | راجاستهان:- ٣٤٢٢٣٩ کیلۆمەتری دووجا. |

| رووبەر- بچووکرتین یەکەی پێکهێنەر | گۆوا Goa – ٣٧٠٢ کیلۆمەتری دووجا. |
| --- | --- |
| کۆی (سەرجەم) دانیشتووانان | ١٠٤٨٢٧٩٠٠٠ (ساڵی ٢٠٠٢). |
| دانیشتووانانی یەکە پێکهێنەرەکان ڕێژەی ٪ سەدی بۆ کۆی دانیشتووانان | نۆتارپڕادیش ١٦,١٪. مەهاراشترا ٩,٤٪. میزۆرام ٨,٧٪. بێهار ٨,١٪. بەنگالی خۆرئاوا ٧,٨٪. ئانداپڕادیش ٧,٤٪. تامیل نادۆ ٦٪. مادیا پڕادیش ٥,٩٪. راجاستهان ٥,٥٪. کارناتاکا ٥,١٪. گوجارات ٤,٩٪. ئۆریسا ٣,٦٪. کەرالا ٣,١٪. ئاسام ٢,٦٪. جهارخاند ٢,٦٪. پونجاب ٢,٤٪. دادراوناگار هاڤەلی ٢,١٪. جهانیگار ٢٪. هاریانا ٢٪. دەلهی ١,٣٪. جامۆوکشمیر ١٪. ئوتارانچال ٠,٨٪. هیماچال پڕادیش ٠,٦٪. تریپۆرا ٠,٣٪. مانیپور ٠,٢٪. میگهالایا ٠,٢٪. ناگالاند ٠,٢٪. ئاروناچال پرادیش ٠,١٪. گۆوا ٠,١٪. چاندیگار ٠٠٩٪. یۆندیچیری ٠٠٩٪. سککیم ٠٠٥٪. دوورگەکانی ئەندامانو نیکۆیار ٠٠٣٪. دامانو دایۆ ٠٠١٪. لاکشادویپ ٠,٠٠٦٪. |
| سیستمی سیاسی- فیدرالیی | کۆماری فیدرالیی- سیستمی پەرلەمانتاریی |
| سەرۆکی ویلایەت- فیدرالیی | سەرۆك ئەڤولپەکر جێنولایدین عەبدولکەلام، سەرۆك لەلایەن دەستەیەکی هەڵبژاردن کە پێکهاتووە لە ئەندامانی هەڵبژێردراو لەهەردوو ئەنجوومەنەکانی |

| | |
|---|---|
| | پەرلەمانو یاسادانەرانی ویلایەتەکانەوە بۆماوەی (٥) پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێت. دوایین هەڵبژاردن لە تەمووزی ٢٠٠٢دا کراوە (هەڵبژاردنی داهاتوو بڕیارە لە تەمووزی ٢٠٠٧دا بکرێت). |
| سەرۆکی حکومەت- فیدرالیی | سەرەك وەزیر (شری ئاتال بیهاری فاجپایی (لە ١٩٩٨ەوە). سەرەك کۆمار سەرکردەی ئەو پارتە یان هاوپەیمانییەی زۆرینەی لایەنگرانی وەزیرەکانی لە (لۆك سابها)دا هەبێ بە سەرەك وەزیران دادەمەزرێنێت. ئەنجومەنی وەزیران لەلایەن سەرۆکی کۆمار لەسەر پێشنیازی سەرەکوەزیرانەوە دادەمەزرێنرێت. (هەڵبژاردنەکانی داهاتوو بڕیارە ساڵی ٢٠٠٤ ئەنجام بدرێت). |
| بونیادی حکومەت- فیدرالی | دوو ئەنجومەنیی:- پەرلەمان<br>ئەنجوومەنی باڵا- (Upper House)-<br>راجیا سابها (ئەنجوومەنی ویلایەتەکان)، لە ٢٥٠ کورسیی زیاتر نابێت، ١٢ دوانزە ئەندامیان سەرۆك کۆمار دایاندەنێتو ئەوانەی دیکەیش لەرێگای نوێنەرایەتیکردنی ڕێژەییەوە (دەنگی تاك کە بۆی هەیە بگوێزرێتەوە) بۆ خولێکی شەش ساڵی لەلایەن ئەندامانیی ئەنجومەنەکانی یاسادانانی ویلایەتەکانو |

| | |
|---|---|
| | ناوچەکانەوە هەڵدەبژێردرێنو، هەردوو ساڵ جارێک سێیەکەکیان (٣/١) هەڵدەبژێردرێنەوە. ئەنجومەنی پایین- لۆک سابها (ئەنجومەنی گەل) زۆرترین ژمارەی ئەنجومەنەکە ٥٥٢ ئەندامن. ئەندامان بە هەڵبژاردنی راستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن. تەنیا دوو ئەندام لە کۆمەڵگەی ئەنگلۆ- هیندیی. لەلایەن سەر کۆمارەوە دادەنرێن ئەگەر بە بۆچوونی خۆی ئەو کۆمەڵگەیە لە ئەنجوومەنەکەدا وەك پێویست نوێنەرایەتی نەکرابێ. لۆك سابها لەو رۆژەوەی بۆ یەکەمین کۆبوونەوەی دەستنیشان کرابێت ماوەی پێنج ساڵان بەردەوام دەبێ. |
| ژمارەی نوێنەران لە ئەنجوومەنی پایینی حکومەتی فیدراڵیی لەو یەکەیەی زۆرترین ژمارەی دانیشتووانانی هەیە- ئۆتار پرادیش. | (٨٥) نوێنەر |
| ژمارەی نوێنەرانی ئەو یەکەیانەی کەمترین ژمارەیان هەیە لەنێو ئەنجومەنی باڵای حکومەتی فیدراڵییدا. | لاکشادویپ/١- پۆندیچێری/١- دوورگەکانی ئاندامانو نیکۆبار/١- چاندیگار/ ١- دادراوناگار هاڤەلی/١- دامانو دایو/ ١- سیککیم/١- میزۆرام/١- ناگالاند/١. |

| | |
|---|---|
| دابەشبوونی نوێنەرایەتیی لە ئەنجوومەنی باڵای حکومەتی فیدراڵدا | ئەندراپرادیش/١٨، ئاروناچاڵ پرادیش/١، ئاسام/٧، بیهار/١٦، چهاتسگار/٥، گۆوا/١، گوجارات/١١، هاریانا/٥، هیماچاڵ پرادیش/٣، جامۆوکشمیر/٤، جهارخاند/٦، کارناتاکا/١٢،کەراڵا/٩، مادهیاپرادیش/١١، ماهاراشترا/١٩، مانیپور/١، میگالایا/١، میزۆرام/١، ناگالاند/١، ئۆریسا/١٠، پونجاب/٧، راجاستهان/١٠، سیککیم/١، تامیل نادۆ/١٨، تریپورا/١، ئوتارانچاڵ/٣، ئوتارپرادیش/٣١، بەنگالی خۆرئاوا/١٦.<br>تێبینی: ناوچە یەکگرتووەکان لێرەدا نینە. |
| دابەشبوونی دەسەڵاتەکان | حکومەتی فیدراڵ دەسەڵاتی گشتگیری هەیە بۆ یاساسازی پتر لە (٩٧) بابەتاندا (وەکو: بەرگریی، کاروباری دەرەوە، گەیاندنو پەیوەندیی، دارایی‌و لێدانی پارە، کاروباری بانکەکانو گومرگ)، لە کاتێکدا ویلایەتەکان دەسەڵاتی تەواویان هەیە بەسەر (٦٦) بابەتدا، وەکو (پۆلیسو ئارامیی‌و نیزامیی گشتیی، کشتوکاڵ‌و ئاودێریی، پەروەردە، تەندروستیی گشتیی‌و حکومەتی خۆجێیی). کەچی (٤٧) بابەت هەنە دەسەڵات بەسەریاندا هاوبەشییە وەکو (پلاندانانی ئابووریی‌و کۆمەڵایەتیی، |

| | |
|---|---|
| | قانوونی تاوانکاران، پەروەردە، کۆنترۆلکردنی دانیشتووانان، نەخشەدانانی خێزانیی، کۆنترۆلکردنی کارو کرێو نرخ). لەرووودانی هەر ناکۆکییەك لەنێوان قانونی فیدراڵو قانونی ویلایەتدا سەبارەت بەهەر بابەتێکی هاوبەشی دەستوورییەوە، سەرکەوتن بۆ قانونی فیدراڵ دەبێت. |
| دەسەڵاتەکانی تر | دەسەڵاتەکانی تر بۆ یەکێتییەکە دەگەڕێتەوە. ماددەی تر پەیوەستن بە پێوەندییە کارگێڕییەکانی نێوان یەکێتییەکەو ویلایەتەکانداو بازرگانیی نێو ویلایەتەکانو پێوەندییەکانو گواستنەوەی فیدرالیی‌و زمانی رەسمییەوە. |
| دادگەی دەستووریی (باڵاترین دادگە کار لە کێشە دەستوورییەکاندا دەکات) | باڵاترین دادگەی هیندستان، لە دادوەرێکی سەرۆكو چەند دادوەری دیکە پێکدێت کە ژمارەیان لە ۲٥ تێپەڕنەکات لەلایەن سەرۆکی هیندستانەوە دامەزرێنرێن. دادوەران لەتەمەنی ٦٥ ساڵیدا خانەنشین دەبن. |
| سیستمی رامیاریی یەکە پێکهێنەرەکان | ئەنجوومەنگەلی یاسادانان (ڤیدهان سابها Vidhan Sabha) لەنێوان ۳۲ هەتا ٤۲٥ ئەندام پێکدێن، بەشێوەیەکی ئاسایی بۆ خولێکی ٥ پێنج ساڵی هەڵدەبژێردرێن. |

| | |
|---|---|
| هەندێ لە ویلایەتە گەورەترەکان ئەنجومەنێکی بچووکتری یاسادانانیان هەیە پێیدەگوترێت ئەنجومەنی یاسازیی (ڤیدهان پریشاد Vidhan Prishad). | |
| سەرۆکی ویلایەت- پارێزگار، لەلایەن سەرکۆمارەوە دادەمەزرێنرێت، بە ڕاسپاردەو پەسەندکردنی سەرەکوەزیران، بۆ ئەوەی ماوەی پێنج ساڵان خزمەت بکات. سەرۆکی حکومەت- سەرەکوەزیر سەرۆکایەتی ئەنجومەنێکی وەزیران دەکات کە لەئەنجومەنی یاسادانانەوە وەرگیراون. | سەرۆکی حکومەت- یەکە پێکهێنەرەکان |

**خشتەی ژمارە (٢):**

**هێما ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکان**

| | |
|---|---|
| کۆی داهاتی گشتیی ساڵانە GDP ٢,٧ تریلیۆن دۆلاری ئەمریکی (٢٠٠٢). پشکی تاك (هەر تاکێك) لەداهات ٢٥٧٠,٩ دۆلاری ئەمریکی (ساڵی ٢٠٠٢). قەردی نیشتمانیی (دەرەکیی) ٩٧,٣ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی (٢٠٠١). قەردی لاوەکیی ناڕاستەوخۆ ٨٢,٦ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی. ڕێژەی بێکاریی نیشتمانیی ٨,٨٪. یەکەی‌پێکهێنەر کە زۆرترین ڕێژەی | |

| | |
|---|---|
| | بێکاریی هەبێ: گۆوا Gao- ١٣,٦٪.<br>یەکەی پێکهێنەر کە نزمترین ڕێژەی بێکاریی هەبێ: گوجارات‌و راجاستهان ٠,٨٪.<br>ڕێژەی خوێندەواریی هەرزەکاران (گەنجان) تەمەنی ١٥-و بەسەرەوە ٥٨٪.<br>ڕێژەی خەرجیی لەکۆی گشتیی داهات بۆ پەروەردە ٤,١٪.<br>هیوای ژیان بەساڵ ٦٣,٣ (ساڵی ٢٠٠١)<br>داهاتی حکومەتی فیدراڵ لە گومرگ‌و سەرچاوەگەلی هاوپێوەند (٢٠٠٢- ٢٠٠٣) ٤٥,٦ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی.<br>داهاتی یەکە پێکهێنەرەکان لە گومرگ‌و سەرچاوە هاوشێوەکان ٣١,٤ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی (٢٠٠٢- ٢٠٠٣).<br>یارمەتییەکانی ناوەند (فیدراڵ) بۆ یەکە پێکهێنەرەکان ١١,٥ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی (٢٠٠٢- ٢٠٠٣). |
| میکانیزمەکانی هاوسەنگی (یەکسانی) کردن | بەخشش‌و یارمەتی مەرجدارو بێ مەرجیش. هەروەها پشك‌و بەش لە باج‌و گومرگی فیدراڵی‌و بۆ ویلایەتەکان دەنێردرێن لەسەر راسپاردەی (کۆمیسیۆنەکانی دارایی) سەربەخۆوە. |

# بەلژیکا

**شانشینی بەلژیك** Kingdom of Belgium

**نووسینی: ئەندریا لیکۆرس** Andr’e Lecours

## ١- دیرۆك و گەشەكردنی فیدرالیزم

بەلـــژیك دیموكراســـییەكی بـــچووكی ئـــەورووپای خۆرئاوایـــە، رووبەرەكەی (٣٢٥٤٥كم٢)و، ژمارەی دانیـشتوانانەكەی كـەمێك لـە ١٠ دە ملیۆن كـەس زیـاترە، پێناسـەی رامیـاریی وڵاتەكـە لـە خەسڵەتی فرەزمانییـدا بەرجەسـتەیە، نیوەكـەی بـاكووری بەلـژیكا، فلانـدەرز-نیشتەنیی كۆمەڵانی هۆڵەندیزمانەكانـە (كـە نزیكـەی ٦ شـەش ملیـۆن دەبـن و، بـە فلـەمیش(Flamish) ئاماژەیـان بـۆ دەكرێـت، كەچـی، بەشـەكەی باشـوور، والۆنیـا، (Wallonia) كـە ٣,٢ سـێ ملیـۆن و لـەدەیا سـێی ملیـۆنێكن، فەرەنـسیزمانن. وەلێ، ئـەم تابلۆزمانییـە بەبوونی ژمارەیەكی كـەمی دانیـشتوانانی جـەرمانیزمان لـە باشـووری رۆژهەڵاتدا شێوێنراوە كـە نزیكـەی (٧٠,٠٠٠) هـەفتا هـەزار كەسـێكن،

هەروەها بڕۆکسلییەکان (Brussels) (یەك ملیۆن کەس) کە کەوتۆتە سەرووی سنووره زمانییەکانەوه بەڵام، بەزۆری زمانی فەرەنسی تیایدا زاڵە. توندوتیژیی نێوان گروپە زمانییەکان هەر لە سەدەی نۆزدەمەوه هەمیشە ئادگارێکی ناوەندیی سیاسەتی بەلژیکی بووه، ئەوەیش بەدوو دابەشبوونی بنەڕەتیی ترەوه لەم دەوڵەتە لێکدراوەدا گرفتار بووه کە برێتیبوون لە ئایین و چینایەتیی.

کێشەی درێژخایەن و هەمیشەیی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان وەکو لە سیاسەتەکانی نەتەوایەتیی/ ئایینیدا رەنگیداوەتەوه بزوێنەرو داینەمۆی پڕۆسەی نوێی بەفیدرالیبونی دەوڵەتی بەلژیك بووه.

سنوورەکانی ئیمڕۆی بەلژیکا لە شانشینی هۆڵەندییەوه دابڕێنراون و ساڵی ١٨٣٠ لەلایەن کەسایەتییەکی بورژوازی فەرەنسییەوه کە دژی سیاسەتەکانی شاویلیامی یەکەمی (ئۆرێنج) بووه لەمەڕ زمان و ئایینەوه، کراونەتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ (بەلژیکا).

بەلژیکا، وەکو دەوڵەتێکی یەکگرتووی ناوەندیی زۆر بەهێزو، سەرەڕای نەبوونی برگەو ماددەی فەرمیی دەستووریی تایبەت بە بەکارهێنانی زمانەوه، بە تەواوەتی کاریان بەزمانی فەرەنسیی دەکرد.

ئەم ڕەوشتە لەلایەن پتی بورژوا تەقلیدییە فلەمیشیەکانەوە ئەوانەی بەلّژیکایان وەك نیشتمانێکی جووتزمانو دوو کەلتووریی دەدی، مایەی قەبولّکردن نەبوو. هەر لەم دیدگەیەشەوە، وەختێ بزووتنەوەی فلەمیشی سەریهەلّداو کەوتە خەباتکردن بەمەبەستی بەدەستهێنانی یەکسانیی بۆ هۆلّەندیی نەژادەکان لەگەلّ فەرەنسیزمانەکاندا. ئیتر، وێڕای بەرهەلّستیکردنی کۆمەلاّنی خەلّکی فەرەنسیزمان، یەکسانیی فەرمیی بەپێی یاسا لەسالّی ١٨٩٨دا هاتە کایەوە، ئەوەیش بەقانونی دی ڤرێندت- کۆرمانس ( De Vriendt- Coremans Law) بوو هەرچەند زمانی فەرەنسیی وەك زمانی سەرەکییو زالّ مایەوە.

دواتر بزاڤی فلەمیشی هەولّیدا پێگەیەکی فەرمیی بۆ رەوشی جووتزمانی بۆ هەرێمە فلەمیشزمانەکان دەستەبەر بکات وەلێ، ئەم داخوازییانەیان، بەتایبەتی ئەوانەی سەبارەت بە باشوور، ڕووبەڕووی بەرهەلّستییەکی بەهێزی فەرەنسیزمانەکان بوونەوە.

لەم حالّەتەدا بزاڤی فلەمیشی چالاکییەکانی خۆی لە پانتایی فرەوانی ولاّتەوە بەرەو بەشەکانی باکوور گوێزرایەوە تا رەوشی فرەزمانی بەشێوەیەکی رەسمیی بۆ ئەوێ بچەسپێنێت. ئەم ئامانجەشیان بەشێوەیەکی فرەوان لەسالّەکانی ١٩٢٠ یەکاندا بەدیهاتو چەند یاسایەکی زمانیی بۆ رەواییدان بە فرەزمانیی

ناوچـــەیی دەرچـــوێنران. هەرچـــی فەرەنـــسیزمانەکانیش بـــوون (بزووتنـــەوەی والـــۆون)یـــان پێکهێنـــا بەمەبەسـتی بەرهەڵـستیکردنی داخوازییەکانی بزاڤی فلەمیشی. یەکەمین پەرچەکرداریشیان ئـەوەبوو داوای گێڕانەوەی بەلژیکایان دەکرد بـۆ رەوشـی بـەر لەساڵی ١٨٣٠، بـەڵام کـە (بزاڤـی فلەمیـشی) رۆژ دوای رۆژ بـەهێزتر دەبـوو، ئـەمان ستراتیژیەتی خۆیانیان گۆڕیو، فەرەنسیزمانەکانیان لـە (فلانـدەرز)و دواتـریش لـە (بروکـسل) پـشتگوێ خـستن‌و چـاویان بڕیـە دەڤـەری (والوونیا) کە زمانی فەرەنسی تیادا زاڵ‌و بەدەسەڵات بوو.

کێشەکەی پێوەندیی کۆمەڵایـەتی لـەپاش جـەنگی دوهـەمی جیهانییـدا ئەوەنـدەیتر بـەرەو گرژیـی‌و ئـاڵۆزیی چـوو وەختێـك لەئەنجامی هەڵوێستی شا لیۆپۆڵدی سێهەم لەمەڕ تەرخانکردنی پـارە بـۆ قوتابخانـەکان زنجیرەیـەك کێـشەو هـەرا هـەردوو کۆمەڵگـە زمانییـەکانی دژی یـەکتری کردنـەوە. سیاسـەتوانان هەوڵیانـدا لـەرێی بـەهێزکردنی رەوشـی (فرەزمـانیی) ناوچـەییەکان بـەهۆی دانـانی یاسـاگەلی تـازەی زمانییـەوە ئـەو گرژیـی‌و ناکۆکییانـە دامرکێننـەوە. سـاڵەکانی ١٩٦٢- ١٩٦٣ ژمـارە یاسـایەك دەرچـوێنران کـە چـوار هـەرێمی زمانییـان دروسـتکرد:- (فلانـدەرز)ی فرەزمـان، (والۆنیـا)ی فرەزمان، (برۆکسل)ی جووتزمان، لەگەڵ ناوچەیەکی (جەرمانیزمان). ئەوجا بە زنجیرەیەك سەرژمێرکردنی دانیشتوانان تخووبی قەڵەمڕەوی

زمانەکانیان دەستنیشانکردن‌و، کۆمۆنەکان‌و شارەوانییەکان خرانە نێو هەرێمی زمانیی گونجاوی تایبەت بەخۆیانەوە. سنوورەکەش دواتر لەساڵی ١٩٦٢وە چیتر کاری پێنەکرا، بەوەی کە سەرژمێرییەکە وەکو ئامرازێك بۆ سازدان‌و گونجاندن وازی لێهێنراو، بەهیوای پەرەپێدانی زیاتر بەیەکسانیکردن بایەخی پتر درا بە چەسپاندنی یەکزمانیی کارگێڕییەوە. وەلێ، ئەم ستراتیژیەتەش سەری نەگرت چونکە گرژیی لە ساڵەکانی شەستەکاندا بە دامەزراندنی حزبە تازە دروستبووەکانی کۆمەڵگەکاندا هەر درێژەی کێشا. ئەم حزبانەش (فۆلکسونی) نەتەوەیی فلەمیشی‌و (راسیمبلەمێنت والوون)ی سەر بەهەرێمی والوون‌و، بەرەی (دیموکراتیکی فرانکۆفۆنەکان) کە لە (برۆکسل) دامەزرابوو، ئەمانە فشاری هەڵبژاردنی سیاسیی بەرچاویان خستبووە سەر پارتییە تەقلیدییەکانی وەك (دیموکراتی مەسیحی، سۆشیالیست‌و لیبراڵەکان). حزبە سیاسییە تەقلیدییەکان، کە ناچارکران خەباتی پتر لە کێشەکانی کۆمەڵایەتی خەڵکدا (لەنێو کۆمەڵ) بکەن، پەرەی زیاتریان بە باڵە زمانییەکانداو، ساڵەکانی حەفتاکان لەسەر بنچینەی زمانیی ئینشقاقیات تێکەوت.

ئەوەی راستی بێت، تایبەتمەندییەکی کە سیستمی سیاسیی بەلژیکی هەیەتی: برێتییە لە سیستمی پارتایەتییەکەی!

لەولاتی بەلژیکادا هیچ حزبێکی نەتەوەیی بوونیان نییە، بگرە پارتەکان گشتیان تایبەت بە زمانەکانن. وەك دەرەنجامی ڕێوشوێنە هاوپشك و یەکگرتووەکانی بەلژیکا، ئەم گۆڕانکارییە بووە هۆی دابەشبوونی زیاتری لە ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسیی دا، بۆ نموونە: سەندیکاو یەکێتییەکانی بازرگانیی ئەگەرچی بە فەرمیی یەکگرتووەو نوێنەرایەتی بەرەیەکی گشتیی و هاوبەش دەکات لەبەرامبەر دەسەلاتە گشتییەکاندا، وەلێ، پەرەی بەچەندین گروپی جوداوازیش داوە بۆ کاری زمانەوانیی. هەروەها چەند دامەزراوەیێکی خۆبەخش و ژمارەیەك ڕێکخراوی کۆمەلگەی شارستانیی (مەدەنی) پێکهاتەگەلی دووجەمسەرییان بۆ خۆیان هەلبژاردبوو پیادەیان دەکرد.

بە فیدرالبوونی بەلژیکا هەنگاو بەهەنگاو جێبەجێکرا. زۆران چاکسازیی دەزگەیی و دەستووریی لە سالەکانی ١٩٧٠، ١٩٨٠، ١٩٨٨و هەروەها ١٩٩٣ دا ئەنجامدران. هۆکاری سەرەکیی بۆ سروشتی پەرەسەندنی پرۆسەکە ئەوەیە کە پارتییە فلەمیشییەکان و فەرەنسیزمانەکان مۆدێلگەلی فیدرالیزمی جوداوازو هەمەجۆریان پەسەند دەکرد. لایەنە فلەمیشییەکە داکۆکیان لە فیدرالیزمێکی دوو قۆلی دەکرد بۆ هەردوو کۆمەلگە زۆرینەیەکانی زمانیی و کەلتووریی، کەچی سەرکردەکانی فەرەنسیزمانەکان پێیانوابوو فیدرالییەتی سێ لایەن کە تیایدا والوونیا و برۆکسل و فلانسدەرزیش

یەکەپێکهێنەرەکانی بن پەیرەوی بکرێت باشترە. ناکرێ ئەوەیش نادیدە بگرین کە ئەم گۆڕانکارییە دەستوورییانە هەمان کات لەو دانوستاندنانەوە هاتن کە توخمێکی گرنگو پێویستی حکومەتە هاوپەیمانەکانن، ئەوەی کە تایبەتمەندیی خۆی هەیە لە سیاسەتتی فیدراڵیی بەلژیکادا.

تەنگژەکانی لەمەڕ پێوەندیی کۆمەڵایەتیی نێوان گروپە زمانییەکان لە سەرەتای پرۆسەکەی بەفیدرالبووندا، ئێجگار ئاڵۆزو دژوار بوون کە بە سانایی کۆتاییان پێنەدەهێنرا. لەنێوەراستی هەشتاکاندا رەوشەکە تەقییەوە، ئەوەیش وەختێ بوو کە، پارێزگاری ڤۆیرن (the Mayor of V oeren)- بە فەرەنسیی پێیدەگوترێ (Fourons) کە شارەوانییەکی بچووکی (٤٠٠٠) چوار هەزار کەسیی بوو لەساڵی ١٩٦٣ دا لە (والوونیا) دابڕێنرابوو خرابووە سەر فلاندەرز ئەو پارێزگارە رازینەبوو زمانی هۆڵەندیی (Dutch) لە کاروبارە فەرمییەکاندا بەکارببرێت وەکو لە یاسادا رێی پێدرابوو!

ئەو رووداوەی (ڤۆیرن) بووە هۆی پێداچوونەوەی ساڵی ١٩٨٨ بە دەستوورەکەداو، رێککەوتنو سازش کرا بەسەر (برۆکسل) کە کرایە یەکەیەکی فیدراڵی هەروەکو پارتییە فەرەنسیزمانەکان خۆاستیان بوو، لەبەرامبەر ئەوەشدا حزبە فلەمیشییەکان مافی پارێزگاریکردنیان لە کەمینە فلەمیشییەکانی ناو برۆکسل

بەدەستهێنا، لەگەڵ رێککەوتننامەیەك کە سنووری شارەکە نابێ تخووبەکانی ۱۹ نۆزدە کۆمیۆنەکان تێپەڕێنێت. سەرەتای نەوەدەکان بڕیاری حزبە چەپڕەوە فلەمیشییەکان ئەوەبوو کە بەرهەڵستی گرێبەستێکی فرۆشتنی چەکو تەقەمەنیی بۆ (عەرەبەستانی سەعوودی)بکەن کە سوودی بە پیشەسازیی (والوون) دەگەیاندو، ئەمە تەنگژەو قەیرانێکی کۆمەڵایەتی زۆری نایەوە. ئیتر، ئەوەبوو ئەم ناکۆکیی و دووبەرەکییانە بوونە هۆکاری چاکسازییەکانی ساڵی ۱۹۹۳ و بە رەسمیی گۆڕینو گوێزانەوەی ولاتی بەلژیك بۆ دەولەتێکی فیدراڵی.

## ۲- مادەو برگە دەستوورییەکانی پەیوەست بە فیدرالیزم

تایبەتمەندیی فیدرالیزمی بەلژیکا لەوەدایە کە دوو جۆر یەکەی پێکهێنەری جوداواز لەخۆدەگرێت: کۆمەڵگەو هەرێم (مادەکانی ۲، ۳). لە ولاتەکەدا سێ کۆمەڵگە هەنە (فلەمیشی، فەرەنسیی و جەرمانی)و، سێ هەرێمیش (فلەندەرز، والۆونیاو، برۆکسل).

ئەم خەسلەتە جیاکارە سەرنجراکێشە تایبەتە لە ناوەڕۆکی خەباتی مێژوویی (بزاڤی فلەمیشی لەپێناو پاراستنی زمانو کەلتوورو، لەتێکۆشانی نوێتری (بزاڤی والوون) دا بۆ خودموختاریی (ئۆتۆنۆمیی) ئابووریی رەنگدەداتەوەو، بەرجەستە بووە.

کۆمەڵگەکان لەساڵی ١٩٧٠ دا پێکهێنراون و بەبێ دواکەوتن (دەستوور) یان پێبەخشراو، بێجگە لە کۆمەڵگەی جەرمانیزمان کە ساڵی ١٩٨٣ رەوایەتیی دەستووریی بەتەواویی پێدراوە. ئەو کۆمەڵگانە دەسەلاتیان هەیە بەسەر زمان، کەلتوور (رۆشنبیریی)، پەروەردەو خوێندن و کاروباری کەسییەتییدا، هەروەکو لەزمانی دووڕەگو تێکەلاوی بەلژیکادا هەیانە کە بۆ خزمەتگوزارییە کۆمەلایەتییەکانی وەك چاودێریی تەندروستیی (نەك بۆ بیمەی تەندروستیی کە بەشێکە لە ئەرکو بەرپرسیارییەتیەکانی حکومەتی فیدراڵ)، ئەو چاودێرییەش وابەستەیە بە پێوەندیی راستەوخۆی نێوان دەوڵەت و هاوولاتیانەوە.

ئەگەرچی هەرێمەکان یەکەگەلێکن سنووری زەمینیی دیارو ئاشکرایان هەنە، بەلام، کۆمەڵگەکان زێتر بە کەسییەتی زمانییەوە پەیوەستن تا سنوورو زەوی، کە ئەمەیش وایکردووە ببن بە ئالۆزترین رەگەزو توخمەکانی فیدرالزمی بەلژیکی.

ئەندامبوونیشیان برگەی (٤) چواری دەستوور بڕیاری لێدەدات بەگوێرەی هەرێمەکانی زمانیی و ڕەچەڵەك و بنەچەی خێزانییان و بوونیان لە نەژادی فلەمیشەکان، بۆ ئەوەی داوای ئۆتۆنۆمیی رۆشنبیریی (کەلتووریی) بکەن. بەم پێییەش، هۆڵەندیزمانەکان لە (برۆکسل) سەر بە کۆمەڵگەی فلەمیشین، هەمان

شتیش سەبارەت بە ئەوانەی لە (فلاندەرز) دا نیشتەجێن هەروەهایە. کەچی دانیشتوانە فەرەنسیزمانەکانی (برۆکسل) ئەندامی کۆمەڵگەی فەرەنسیین هەروەکو (والۆنیەکان). بەهەرحاڵ، هەندێك حاڵەتی بەدەر لە بیرۆکەی کۆمەڵگەی لەسەر زمان بنیاتنراودا هەیە. بۆ نموونە،

لەراستییدا کەمینە (سەرەکییە) فەرەنسیزمانەکانی (فلاندەرز) سەر بە کۆمەڵگەی فەرەنسیی نین، ئەمە لەبارەی هۆڵەندیزمانە کەمەکانی (والوونیا) ش راستە. بەواتایەکی تر، کۆمەڵگەگەلی وابەستە بە تاکە کەسەکانەوە، نەتەوایەتی لاوەکییان لەنێوان دانیشتوانانی بەلژیکادا پێکهێناوە. هەرێمەکان برێتین لە یەکەگەلی ناوچەیی کە وەکو وەلامدانەوەیەك بۆ داخوازییەکانی والوونیەکان سەبارەت بە ئابووریی هەرێمەکان دامەزرێنرابوون. فلاندەرزو والوونیا ساڵی ١٩٨٠ دەستووریان داناوە– واتە دە ساڵ پتر لەدوای ئەوەوە کە چاکسازییە دەستوورییەکەی ساڵی ١٩٧٠ خواستی کۆ بۆ دروستکردنی هەرێمەکان، بەدەرکەوتووە– برۆکسلیش هەمان شتی لە ساڵی ١٩٨٨ دا بە ئەنجامگەیاندووە.

هەرێمەکان دەسەلاتیان بەسەر ئەم بابەتانەدا هەیە: گەشەسەندنی ئابووریی هەرێمایەتی، نەخشەسازیی و پلاندانانی شارستانیی، بەرێوەبردنی دەڤەرەکان و کۆمۆنەکان، خانووبەرە،

کاروباری گشتییو کۆمەلایەتی، ئاو، ووزە، گواستنەوەو هاتووچۆ، ژینگەو مەشقو راهێنانی کاروپیشە. (هەروەکو بەم دوواییانە رێککەوتننامەیەك ئیمزاکراوە بۆ گواستنەوەی دەسەلات بەسەر سیاسەتی کشتوکاڵیو بازرگانی نێودەوڵەتیەیش بۆ هەرێمەکان).

ساڵی ١٩٨٠ (هەرێمی فلەمیشیو کۆمۆنەکە) دەستوورەکانیان کردنەوەیەك. ئەمەیش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە هەردوو قەوارەکان تا ئێستەیش لە گۆشەنیگای دەستوورییەوە لە (فلاندەرز) بوونیان هەر ماوە، بەلام حکومەتێکی گشتیی فلەمیشیو پەرلەمانێکیش هەنە (لەگەڵ هەندێ لێبەدەربوونی پەیوەست بە (برۆکسل)ەوە، کە بەهۆیانەوە بایەخی زیاتر بە لاسەنگییو ناڕێکی فیدرالیزمی بەلژیکی دەدرێت.

هەرچی حکومەتی فیدرالیشە ئەوە دەسەلاتی بەسەر ئەم بوارانەدا دەشکێت: سیاسەتی کاروباری دارایییو پارەودراو، دادوەریی، ئاسایشی کۆمەلایەتی، (بیمەی دامەزراندن· خانەنشینیو شتهای تر). هەروەها هەندێ لایەنی خزمەتگوزارییەکانی لەشساخیی (بیمە، کە نزیکەی ٩٠٪ی بودجەی تەندروستیی دەگرێتەوە). هەندێ هاوکارییو یارمەتیی گشتیی، بەرگریی نیشتمانییو ئاراستەکردنی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان (هەرچەندە هەرێمەکانو کۆمەڵگەکانیش بۆیان هەیە رێککەوتنامەی نێودەوڵەتیی- نەختێ سنووردار- ساز

بدەن). بەگشتیی لامەركەزیی پێویستییەكی گرنگو سەرەكیی بوو. لەراستییدا، هەرێمەكانو كۆمەڵگەكان بەسەر ٤٠٪ لەسەدا چلی بودجەی نیشتمانییدا باڵادەستن: هەرچەندە ئەم سەرچاوە داراییانە لەلایەن حكومەتی نێوەندەوە دەستەبەر دەكرێت.

چاكسازییەكەی ساڵی ١٩٩٣ دوو گۆڕانكاریی سەرەكیی‌و بنچینەیی بۆ دەستوورەكانی ناوەندو پێوەندییەكانیان لەتەك كۆمەڵگەكان‌و هەرێمەكاندا لێكەوتەوە. گۆڕانكاریی یەكەم برێتیبوو لە دووبارە پێناسەكردنی پێكهاتەو رۆڵی ئەنجومەنی پیران (سینات). ئەنجومەنی پیرانی (سیناتی) بەلژیكا ئەندامەكانی خاوەن دیدو بۆچوونی هەمەجۆرو جوداوازن، لەوانە ٤٠ چلیان راستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن‌و، ٢١ بیستو یەكیان لە (ئەنجومەنەكانی كۆمەڵگەكانەوە) وەردەگیرێن، بەم شێوەیە:-

(١٠ دە ئەندام لەهەر یەك لە ئەنجومەنەكانی كۆمەڵگەكانی فلەمیشی‌و فەرەنسیی‌و (١) یەكێكیش لە (ئەنجومەنی كۆمەڵگەی جەرمانیزمانەكان) دەبن. (١٠) دەی دیكەشیان سیناتۆرەكان دایاندەمەزرێنن. لەو هەردوو بەشانەی كە لە پێشەوە ناویان هاتووە. لە سەرجەم حاڵەتەكاندا ئەنجومەنی پیران دەتوانێ لە پرۆژەی یاسایەك بكۆڵێتەوەو پێشنیازی هەمواركردنی بۆ بكات كە دەشێ لەلایەن خانەی نوێنەرانەوە پەسەند بكرێ یان نەكرێت. هەروەها ئەو

دەسەڵاتەیشی پێدراوە دەستپێشکەریی یاسادانان بکات، وەلێ، وتەی کۆتایی هەر بۆ (خانەی نوێنەران) دەگەڕێتەوە. سەبارەت بەو بابەتانەی پەیوەستن بە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانو بونیادی دەوڵەتیشەوە پرۆژە یاساییەکان دەبێ لەلایەن هەردووك خانەی نوێنەرانو ئەنجومەنی سیناتەوە بەیەکسانیی پەسند بکرێن. بۆ کێشەکانی کۆمەڵگەش، پرۆسەی یاسادانانیی ڕێوشوێنی تایبەت دێنێتە پێشەوە کە پێویست دەکات لایەنگیریی پشتگیریی لێکردنی زۆرینەی هەردووك گروپە زمانییەکانی (فلەمیشیو فەرەنسیی) لەهەردووك ئەنجومەندا (خانە) و سینات بەدەست بێنێت لەگەڵ زۆرینەی ٢/٣ دووسێیەکی هەر یەك لە هەردوو ئەنجومەنەکانیشدا.

بۆ ئەندامییەتیش لە گروپێکی زمانەوانیی نێو پەرلەماندا ئەوە لەلایەن سیستمی زمانەوانیی ئەو ناوچەیەی هەڵبژاردنەوە بڕیاری لێدەدرێت کە پارلەمانتارەکەی تیادا هەڵبژێردراوە. بەڕەسمی بوونی ئەم گروپانەیش لە حوکمی مادده (٤٣) چلو سێهەمی دەستوورەوە سەرچاوە دەگرێت.

دووهەم گۆڕانکاریی کە چاکسازییەکەی ١٩٩٣ هێنایە ئاراوە داهێنانی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ بوو لە هەردوو پەرلەمانەکانی فلەمیشیو والوونی کە پێشتر ئەندامەکانیان لەخانەی نوێنەرەکانەوە دەهێنران. پەرلەمانی فلەمیشی لە ئێستادا (١١٨) ئەندامی ڕاستەوخۆ

هەڵبـژێردراوی هەنــە لەگــەڵ ٦ شــەش ئەنـدامی دی کـە لــە گرووپــی فلەمیشی نێو پەرلەمانی (برۆکسل)ەوە کێشراونەتەوە.

پەرلەمانی ناوچەی پایتەختی هەرێمەکەیش کـە هــەر لەساڵی (١٩٨٨)ەوە ئەندامــەکانی راسـتەوخۆ هەڵدەبـژێردرێن. لەئێـستادا ٧٥ حەفتاو پێنج نوێنەری هەنــە– شەسـتوپێنجیان (٦٥) فەرەنـسیزمان‌و ١٠ دەیشیان هۆڵەندیزمانن. ئەنجومەنەکەی کۆمەڵگە فەرەنسییەکەش لەسەرجەم ئەندامانی پەرلەمانی والـوونی، لەگـەڵ ١٩ نـۆزدە ئەنـدامی فەرەنــسیزمانی نێــو پەرلــەمانی برۆکــسلدا پێکــدێت. کۆمەڵگــەی جــەرمانیزمانیش هــەر لەســاڵی (١٩٨٣)وە هــەر (٢٥) بیــستوپێنج ئەندامەکانی خۆی بەشێوەیەکی راستەوخۆ هەڵدەبژێردرێت.

لــە دەرەنجــامی ئــەم گۆڕانکارییانەشــدا ژمــارەی ئەنـدامانی (خانەی فیـدراڵ) بـۆ ١٥٠ سـەدو پـەنجا کـەس کەمکرایـەوە، کـە هـەر بەشـێوەی راســتەخۆ دێنــە هەڵبــژاردن، ئــەوەیش بــە پێڕەوکردنــی سیستمێکی رێژەیی بۆ نوێنەرایەتیکردن (ماددەی ٦٢).

هەسـتایریی بەرامبـەر پاراسـتنی کەمینـەی فەرەنـسیزمان لـە دەسەڵاتی جێبەجێکردنی فیدراڵدا رەنگدەداتەوە کە لەوێـدا پێویـست دەکات ژمارەی وەزیرە جەرمانیزمان‌و فەرەنسیزمانەکان وەکـو یـەک‌و یەکسان بن (برگەی ٩٩).. هەرچی سەرەکوەزیریرانیـشە ئـەوا (بـەدەر لـەو مەرجـە) بـەزۆری لـە فلەمیـشیەکان دەبێـت. بەشـێکی تـر لـە

پێکهاتەی دەسەڵاتی ناوەندیی دوانەیی بەلژیکا خودی (شا) یە کە لەئێستادا ئەلبەرتی دووهەمە (Albert II)، کەسایەتییەکی زمانەوانیی نییە، وەلێ پایە شکۆدارییە ڕەمزییەکەی لەوەدایە کە نوێنەرایەتی سەرجەم گەلی بەلژیکا دەکات ڕەمزییەکەی جوداوازیی کەلتووریی یان زمانەوانیە.

لەلایەکی ترەوە سیاسەتکارانی بەلژیکی هەمیشە دوو دڵ بوونە لە پێدانی دەسەڵاتی بنچینەیی ڕاستەقینە بە دەزگەو دەسەڵاتی دادگەریی سەبارەت بە کاروباری سیاسیی، لەگەڵ ئەوەشەوە بە فیدراڵیکردنی دەوڵەت هیچ خەیارێکی بۆ نەهێشتنەوە ئەوە نەبێ کە (دادگەیەك) دابمەزرێنن ئەرکی ئەوە بێت (ڕەوایەتیی دەستووریی قانوونەکان) بۆخۆی کۆنترۆڵ بکات بەرچاوکردنی دابەشبوونی دەسەڵاتەکان لەنێوان حکومەتی ناوەندو هەرێمەکانو پێکهاتەکەشی لەسەر بنەمای زمانی دایكو بەرهەڵستی کردنی (حکومەتی دادوەران)ەوە بڕیاری لێدەدرێت. بەم شێوەیەش (دادگە) کە لە ١٢ دوانزە (دادوەر) پێکدێت کە نیوەیان هۆڵەندیزمانو نیوەکەی تریان فەرەنسیزمانو، هەروەها نیوەیان (پیشەوەر)و نیوەیشیان کۆنە سیاسەتوانن کە مەرج نییە لە قانوون ڕاهێنرابنو مەشقیان پێدرابێت.

دوو کەسیش سەرۆکایەتیی دەکەن- یەکێك لەهەر گرووپە زمانەوانییەکەوە بە نۆرەو یەك لەدوای یەکدا کارو ئەرکەکانی سەرۆکایەتیی ئەنجامدەدەن. شێوەی ئەنجامدانی هەموارکردنی دەستووری بەلژیکا ئێجگار ئالۆزە. چونکە، جاریٚ دەبیٚ پەرلەمانی فیدرالٚ هەلوەشێنرێتەوە، هەلبژاردنێکی تازە ئەنجام بدرێت، تەنها ئەو کاتە پەرلەمانە تازە پێکهێنراوەکە بۆی دەبێت بەمەبەستی دەنگدان لەسەر پێشنیازی پێداچوونەوەکە بە دەستوور دانیشتنێك ساز بدات. وەبۆ پەسەندکردنی پێشنیازەکەش پێویست دەکات زۆرینەی ٢/٣ دوو لەسەر سێی هەریەك لە ئەنجومەنەکان دەستەبەر بکات. ئەم شێوازە لە ئێستادا نەختیٚ کۆن بووەو باوی نەماوە: چونکە شێوازەکە لە سەردەمێکدا داهێنراوە کە بەلژیکا دەولەتێکی یەکگرتووی یەکپارچە بووە، بەم پێیە یەکە پێکهێنەرەکانی ناگرێتەوەو هیچ ئاماژەیەکیشیی بۆ گرووپە زمانییەکان تیادا نییە.

جێگەی سەرسوڕمانو سەرنجراکێشانە کە پرۆسەی یاسادانانەکە لە ئاماژە بە کێشەگەلی نێو کۆمەلگەکاندا پتر داکۆکیی لە گرووپی زمانەوانیی کەمینەکان دەکات. زیاتر لەوەی لە دەستوورە هەموارکراوەکەدا بۆی پێشنیازکراوە.

دوو برگەی دەستووریی شیاوی باسکردنن لەبەر گرنگیی و بایەخدان بۆ گونجاندنی رامیاریی لە کۆمەڵگە فرە زمانییەکان (یان فرە نەژادیەکان) و بۆ سیستمی فیدرالیزم لە بەلژیکا.

برگەی یەکەم برێتییە لەشێوازی (زەنگی ئاگادار یان وریاکردنەوە) کە بۆ داکۆکیکردنی زیاتر لە فەرەنسیزمانەکان داهێنراوە. ئەم شێوازە رێگە بە گرووپێکی زمانەوانیی لەنێو پەرلەمانی فیدرالیدا دەدات ئەگەر بتوانێ لیستێك بە ئیمزای سێ لەسەر چواری ئەندامەکانی خۆی پێشکەش بکات کە بەشێوەیەکی کاتیی مافی دەستپێشخەری ئەنجومەنی یاسادانان بۆ یاسایەکی تازەبابەت رابگرێت کە هەستی بە مەترسی لێوە بکرێت بۆ سەر کۆمەڵگە یان هەرەشەیەك بێت بۆ پێوەندییەکانی نێو کۆمەڵگە (ماددەی ٥٤). ئەو کاتە، دەقی پرۆژە یاساکە بۆ ئەنجومەنی وەزیران (کە فرەزمانیی تیادایە) دەگەرێتەوەو، ئەنجومەن بۆی هەیە هەمواری بکات یان هەر وەکو خۆی، بەبێ گۆرانکاریی، بیهێڵێتەوە، لەم حاڵەتەشدا لەسەری پێویست دەبێ ئەوە نیشان بدات کە یاسادانەران هیچ ئەنجامێکی نەرێنی (نێگەتیڤ) لە پێشنیازەکەی لایەنگرەکانی پێشبینی ناکەن، ئەگەر نا ئەوە دەبێ پێشنیازەکەیان بکێشنەوە. ئەم شێوازی (زەنگی هۆشیارکردنەوە)یە میکانیزمەی یاسابازیی بۆ زۆران قانوونی تایبەتی و پرەنسیپی فرە زمانیی ئەنجومەنی کارگێریی

بەیەکەوە دەگونجێنێت. هەروەکو لە هەرێمی (برۆکسل)ی جوتزمانیشدا بەکارهێنراوە بۆ پاراستنی کەمینەی فلەمیشیەکان.

دووهەم برگە لە بوارەکانی هاوکاریی نێودەوڵەتییدا دەسەڵات بە هەرێمەکان و کۆمەڵگەکان دەدات، بە دەسەڵاتی بەستنی پەیمان و رێککەوتنامەشەوە لەسەر ئەو بابەتانەی دەکەونە سنووری قەڵەمڕەوی دەسەلاتی خۆیانەوە (ماددەی ١٦٧). لەسەر یەکەکانیش پێویستە حکومەتی ناوەندی لە چالاکیە نێودەوڵەتییەکانی خۆیانەوە ئاگادار بکەنەوە، لە راستییدا ئەگەر حکومەتی فیدڕاڵ هیچ نارەزاییەکی لەمەڕ پەیمانێکی تایبەتی هەبێ ئەوە بۆی هەیە بابەتەکە بنێرێت بۆ دەستەیەکی رازیکردنی میانگیر کە لە ئەندامان و نوێنەرانی سەرجەم حکومەتەکان پێکهاتووە و بڕیارێکی بێلایەنانە دەردەکات یان بەراگرتنی رێککەوتننامەکە، یان رێگەپێدانی بۆ ئەوەی کاری پێ بکرێت و، هەردوو لایەنەکانیش پێی رازیدەبن. جا، ئەگەر هاتوو نەگەیشتن بە رێککەوتنێك ئەوە بۆ حکومەتی فیدراڵ هەیە پرۆسەی رێککەوتننامەکە رابگرێت و بیوەستێنێت تەنانەت بێتو ئەم راگرتنە پێچەوانەی پەیمان و بەڵێنە نێودەوڵەتییەکانی بەلژیکاش بێت، وەیاخۆ وڵاتانی بیانیی، ئەوانەی بەلژیکا پێوەندیی دیبلۆماسی لەگەڵیاندا هەیە، یان نییە، تێوە بگلێنێت.

سەرەڕای ئەم میکانیزمەگەلەی کۆنترۆڵکردنیش، یەکە پێکهێنەرەکانی بەڵژێك دەسەڵاتی فرەوانیان لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا هەیە کە دەکرێ ئاوا بێتە بەرچاو کە لۆژێکی فیدرالییەت بەرەو دوایین ئەنجامی کۆتایی خۆیەوە ببات، یانەخۆ پێشبینی بێت بۆ شێوازێکی رێکخراوەیی سیاسیی لامەرکەزیی کە کارو ئەرکەکان تیایدا لەیەکتر جوداو دابەشکراو دەبن.

دەزگەیەکی گرنگی دیکە لەم بارەیەوە (کۆمیتەی هاریکاریی‌و یەکخستنە) کە دەستەیەکی فرەلایەنییەو لەم کەسانە پێکدێت:- سەرەکوەزیرانی فیدراڵ، پێنج وەزیری فیدراڵ (نێوەند)و شەش ئەندامی حکومەتە فیدرالییەکان (ماددەی ٣١ی قانوونی ئاساییساڵی ١٩٨٠ی چاکسازییە دەستوورییەکان). ئەم دەزگەیە بەشێوەیەکی یەکسان لەنێوان فەرەنسیزمانەکان‌و هۆڵەندیزمانەکادا دابەشکراوە، رۆڵەکەیشی ئەوەیە چارەسەریی بۆ (ناکۆکیی بەرژەوەندییەکان) بدۆزێتەوە، واتە ئەو کردەوانەی بە فەرمانێکی حکومیی لە فیدراسیۆنەکەدا ئەنجامدەدرێن کە دەشێت کاریگەریی پێچەوانەی بەسەر فەرمانێکی دیکەوە هەبێت، دەزگەکە بە رەوایەتیی (یاسایی) فەرمانەکەدا ناچێتەوە، بەڵکو بە دروستیی‌و شیانی راسەقینەی پێوانەو هەنگاوەکانی ئەنجومەنی کارگێڕیی- جێبەجێکردن- یان ئەنجومەنی یاساداناندا دەچێتەوە.

ئەو ئەنجومەنی کارگێڕییەی کەبۆی هەیە زەرەمەند بێت، دەتوانێ بابەتی کێشەکە بخاتە بەردەستی (کۆمیتەکە)وەو، ئەمەیش پڕۆژەی یاساکە بۆماوەی ٦٠ شەست ڕۆژان هەڵدەپەسێرێتو، لەو ماوەیەدا بەدوای دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەکی هاوبەشو سازش لەسەر کردندا دەگەڕێت. هەروەها ئەندامانی ئەنجومەنەکانی یاسادانان بۆیان هەیە بە دەنگدانی ٤/٣ سێچواریەکی ئەندامانی خۆیان پڕۆژەی یاسایەکی ئەنجومەنێکی دیکە بۆ (کۆمیتەی هاوکاریی‌و یەکخستن) بەرز بکەنەوە. ئەوجا، ئەگەر لەماوەی شەست ڕۆژەکەدا هیچ چارەسەرێك پەیدا نەبوو، ئەوە گەڵاڵەنامە یاساییە مشتومڕ لەسەرکراوەکە دەکرێ قەبووڵ بکرێت.

هەڵبژاردنە سەرتاسەرییەکانی ساڵی (٢٠٠٣) ئەو ڕێبازانەی چەسپاند کە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (١٩٩٩) وە دانرابوون: حزبە لیبراڵەکان زۆرینەی کورسییەکانیان مسۆگەر کرد، کەچی، حزبە مەسیحیەکان (کریستیان) لە حکومەتی فیدرال وەدەرنران (دوور خرانەوە) ئەوەیش بۆ دووهەمین جار لەماوەی نزیکەی (٤٠) چل ساڵاندا. حکومەت لەلایەن هاوپەیمانییەتی سۆسیالیست- لیبرالەوە پێکهێنراوە.

هەروەکو پرۆسەی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٣ شکستێکی بەرچاوی بۆ (پارتە سەوزەکان)و پێشکەوتنێکی بۆ ( Vlaams

Blok) حزبی فلەمیشی نەتەوەپەرستی راستڕەوی بەخۆوە بینی.
گۆڕانکاریی زۆر لە سیستمی پارتایەتیدا بۆ ئەم هەڵبژاردنانە کران:
(پارتی سرشیالستی مەسیحی) بووەتە (حزبی سەنتەری دیموکراتی
مرۆڤایەتی)، (دیموکرات مەسیحییەکانی فلەمیش) لە ئێستادا
ناوەکەیان بۆتە کریستەلیژك دیموکراتیش ئەن فلامز ( Christelijk
Democratisch en Vlaams) (CD&V) لیبراڵە
فەرەنسیزمانەکان ئێستێ لەژێر چەترێکدا (سەیوان) چالاکیی
دەنوێنن بەناوی (بزاڤی چاکسازیی) ( Mouvement
Reformatew). لەکۆتاییدا، باڵی چەپی ڤۆلکسۆنی نەتەوەیی
فلەمیشی، دوچاری (ئینشقاق) بووەتەوەو یەك لە پارچەکانی بەناوی
سپیریت (Spirit) چۆتە نێو سۆسیالیستە فلەمیشیەکانەوە
خۆشیان ناوی خۆیانیان ناوە ( Socialistische Partij
Anders).

هەڵبژاردنەکانی ئەم دواییە نەریتو دەستووری سیاسەتەکانی
بەلژیکایان زیاتر چەسپاند کە لە ئێستادا بەباشی جێگیر بووە.
سەرەڕای لەباریەك هەڵوەشاندنەوەی حزبە کۆنە تەقلیدییەکانو
دابەشبوونیان بەسەر هێلە زمانییەکاندا، پارتیگەلی سەر بە هەمان
خێزانی ئایدۆلۆژیاوە لە ئیمڕۆدا بەیەکەوە بەشێکن لە حکومەتی
فیدراڵ، یاخود لە دەرەوەی حکومەتدان.

کێشە سەرەکییەکانی کە رووبەڕووی فیدرالیزمی بەلژیکی دەبنەوە لە (پۆستی کۆمەڵگە)وە سەر هەڵدەدەن. سەرتۆپی کارنامەکانیش (ئاسایشی کۆمەڵایەتییە). هەرچەندە بەلژیک فیدراسیۆنێکی لامەرکەزییە، کەچی بەشی هەرە زۆری پرۆگرامەکانی سیاسەتی کۆمەڵایەتی هەر لە دەستی حکومەتی فیدرالدا ماونەتەوە.

لەهەرێمی (فلاندەرز) فشاری بەهێز هەیە بۆ (بەفیدراڵیکردنی) سیاسەتی کۆمەڵایەتیی. بەڵگەو بیانووش بۆ ئەم هەڵوێستە ئەوەیە کە دانیشتوانی فلاندەرزە زەنگینترەکە (سامانداترەکە) بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ لەرێگەی پرۆگرامە کۆمەڵایەتییەکانەوە بۆ کڕینی دەنگەکانیان بەپارە یارمەتی دانیشتوانەکانی هەرێمی (والوونیا) دەدەن کە لە خۆیان نەدراو هەژارترن. یانەخۆ، پەیوەست بە دەستبلاویی و نەریتی نەتەوەیی فلەمیشەکان، ئەوا هەر خێزانێکی (فلەمیشی) هەموو ساڵێك پارەی کڕینی ئۆتۆمبێلێکی نوێ بۆ هەر خێزانێکی (والوونی) دەدات! ئەم توێژینەوەیەش ئاستی نزمی یەکگرتوویی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی بەلژیکا بەیەکەوە نیشاندەدات. فەرەنسیزمانەکانیش لەلای خۆیانەوە بەرهەڵستی هەر هەنگاوێك بەرەو (دابەشکردنی) ئاسایشی کۆمەڵایەتیی دەکەن و چەندان هۆکارو پاساویان بۆ ئەم هەڵوێستەیان هەیە، لە هەمووان گرنگتر ئەوەیە کە

گۆڕانکارییەکی لەو جۆرە کاریگەریی زۆر نەرێنی (سەلبی)و خەراپی بۆسەر گەشەسەندنو خۆشگوزەرانیی (والوونیەکان) دەبێت.

والوونیەکان هەمیشە دەڵێن کە ئەمان بەشداریی پەرەسەندنو پێشڤەچوونی (فلاندەرز) یان کردووە لە دواداوی سەدەی نۆزدەهەمو لەماوەی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا بەو پێیەی کە باشووری بەلژیکا لانەو کانگەی سەرەکیی ووزەی پیشەسازیی وڵات بووە. جا، دەڵێن هەر برە پارەیەکی ئێستا لە (فلاندەرز)ەوە بۆیان بنێردرێت ئەوە تەنها دانەوەی قەردێکی خۆیانە.

هەژموونی فلەمیشی بۆ بە فیدراڵیکردنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی (سۆشیاڵ) والوونیەکان بەتایبەتی تووشی دڵەڕاوکێو ترس دەکات چونکە ژمارەیەکی زۆری بەساڵاچووەکانیان بەهۆی کارکردنیان لە پیشەسازییە قورسەکاندا دوچاری تەندروستی زۆر نالەبار هاتوونو، لەبەر ئەوە پێویستیان بە پرۆگرامگەلی بەهێزی سۆشیاڵ هەیە.

دوایش بەلای فرانکفۆرتەکانەوە (فەرەنسیزمانەکان) نەک تەنها هەر لە والوونیا، بگرە لە (برۆکسل) یشدا، بە فیدراڵیکردنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی (سۆشیال) بە مانای کۆتایی هاتنی بەلژیکا

دێت مادامەکی بەکردەنی هیچ هێزو دەسەڵاتێکی راستەقینە بۆ حکومەتی فیدراڵ (ناوەند) ناهێڵێتەوە.

سەرکەوتنی حزبە فەرەنسیزمانەکان لە بەرهەڵستیکردنی پرۆسەی بەفیدرالیکردنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی هیچ گەرەنتییەکی بۆ نییە چونکە پێگەی سیاسییان لە بەلژیکادا زۆر لەق و بێ هێزە.

سیناریۆیەکی لەهەموان زێتر رێی تێبچێت برێتییە لە بەفیدراڵیکردنێکی بەرە بەرەو هەنگاو بەهەنگاوی بەرنامە زۆرەکانی کۆمەڵایەتیی کەرتو بەشە جۆربەجۆرەکانی سیستمی ئاسایشی کۆمەڵایەتیی. لەم جەمسەرو بارودۆخەی سیاسیی بەلژیکادا پرس و کێشەی ئاسایشی کۆمەڵایەتیی لە کێشە فرەوانترەکەی ئایندەی سیاسیی بەلژیکاوە جودا ناکرێتەوە. سەرکردە فلەمیشیەکان پێیانوایە هەر هەنگاوێکی تر بەرەو پەرەسەندنی خودموختاریی (ئۆتۆنۆمی)و، هەروەها بەرەو هێنانەکایەی مۆدیلێکی کۆنفیدراڵی، وەیا هەندێ جار وەك تواندنەوەی دەوڵەتی بەلژیك لەنێو بۆتەی نیزامێکی سیاسیی تازەی کێشوەریی وەك (ئەورووپای هەرێمەکان)دا سەیری دەکەن. ئەم بۆچوونەیش لەلایەن (فرانکفۆنەکانەوە)، ئەوانەی پێیانوایە هەر گۆڕانکارییەکی دەستووریی دەبێ دوایین بێتو هیچی تری بەدوادانەیەتو، رەفزی هەر بەرەو لامەکەزییەت چوونێکی تر دەکەنەوە، بە توندیی بەرهەڵستیو دژایەتی دەکرێت. وێڕای

ئەمەیش، پارتییە فرانکۆفۆنەکان لەساڵی ٢٠٠١دا موافەقەیان کرد لەسەر (بەفیدرالیکردن)ی کشتوکاڵ، بازرگانیی دەرەکیی، هەندێ جۆرو بەشی یارمەتیی‌و هاریکاریی بۆ دەرەوە، لەتەك ئیمزاکردنی ژمارەیەك قانوونی خۆجێی (ناوچەیی)و هەرێمایەتیی سەبارەت بە گۆڕینەوەی پارە بۆ زیادکردنی بڕی یارمەتییەکان بۆ (کۆمەڵگەکان).

هەروەها ئەم باقە نوێترین چاکسازییە دەستوورییانە کە بە (رێککەوتننامەی لامبەرمۆنت– یان سانت– پۆلیکارپ) ناسراوە، خودموختاریی دارایی زێتری بۆ هەرێمەکان دەستەبەر کردووە هەروەکو گۆڕانکاریی لە بونیادی ئاڵۆزکاویی دەستووریی هەرێمی (برۆکسل) دا بۆ ئەوە بووە کە رێگە نەدەنە (فلامز بلۆکە) توندڕۆکان هەرگیز ئەو سیستمە سیاسییە ئەوەی بەناوی رێکخستنی لۆمبارد ئەکۆرد (Lombard Accord) ەوە ناسراوە، لەکاری بخەن‌و بیوەستێنن. نەوەکا ناکۆکیی‌و مشتومڕێکی بەردەوام ئەو ١٢٠,٠٠٠ سەدوبیست هەزار فەرەنسیزمانانەی کە لە (فلاندەرز) نزیك بە سنووره زمانییەکە (هەرێمی برۆکسل)، یان لە دەورو پشتیدا دەژین، تێوە بگلێنێت‌و ئەوانیش بگرێتەوە.

ئەم فەرەنسیزمانانە سوودی زۆر لە (ئاسانکارییە زمانەوانییەکان) دەبینن، کە مانای ئەوەیە بەبەر خزمەتگوزارییەکانی شارەوانیی دەکەون کە بابەتێکی ئێجگار پڕ بایەخە لە ولاتی

بەلـژیکادا، بـەو پێیيـەی کـە شـارەوانیی هەمیـشەو بـەزۆری خـاڵی بەیەکگەیـشتنی هاوشـاریی‌و خزمەتــە فیدراڵیەکانــە، ئــەم واقیعــە هەمیشە لـە جەرگـەی یـان لـە چـەقی چـەندان نـاکۆکیی‌و مـشتومڕی دیکـەدا ئامـادەیی هـەبووە. بـەلای حزبـە فلەمیشییەکانیـشەوە ئـەو یارمـــەتیی‌و ئاســـانکارییانە کـــاتیی‌و راگـــوزارین‌و چـــارەنووس‌و سەرەنجامی کۆتایی ئەو خەڵکە فەرەنسیزمانانە هەر توانەوە دەبێـت لـــەنێو بۆتـــەی کولتـــووری زاڵـــی فلەمیـــشییدا. کەچـــی پارتـــەکانی فەرەنیسزمانەکان لای خۆیانەوە بە توندیی سەرزەنشتیی ئەم وەزعـە دەکەن‌و ئاسانکارییە زمانەوانییەکان بە رێوشوێنی جـێگیرو بـەردەوام سەیر دەکەن. ئەم هەڵوێستە ناکۆك‌و دژبەیەکانە ئەگـەری ئـەوەی بـۆ کێشەی کەمینـەی فەرەنـسیزمانەکانی (فلانـدەرز) لێدەکەوێتـەوە کـە ببێتـە هۆکـاری دروسـتبوونی نـاکۆکیی‌و توندوتیـژی‌و پێکـدادان لـە سیاسەتی سەردەمی ئێستەی بەلژیکادا.

سەرچاوەیەکی دیکەی بارگرژیی لـە سیاسـەتەکانی بەلـژیکادا لــە (فلامــز بلــۆك Vlaams Blok) ەوە دێــت کــە حزبێکــی نەتەوەپەرستی ئەو پەڕی راستڕەوەو دژایـەتی (کۆچـکردن) دەکـات‌و چوارچـێوە سیاسـییەکەی بەلـژیکا رەتدەکاتـەوە. ئـەو حزبـە (فلامـز بلــۆك) لــە رووی سیاســییەوە لــە پارتــەکانی دیکــەوە ئەوانــەی بەشـێوەیەکی گـشتیی بــە (نــادیموکراتیی) دایــدەنێن، وەلانــراوە، لەهــەمان کاتــدا پارتــەکانی فەرەنــسیزمانەکانیش وەك (فاشیــست)

ئامـاژەی پێدەکـەن. هەرچـی (فلامـز بلـۆك) یـشە بـەوە بەرپەرچیان دەداتـەوە کـە کۆشـش‌و هەوڵـەکانی حزبـە تەقلیدییـەکان لـەپێناو کپکردنـی دەنگـی ئەمانـدا بـە بەشـداریی (میـدیا)و ئەکتـەرە سۆشیالیستەکانی تر لەو پیلانەیانـدا، نیشانەی ئاشکرای نـەبوونیی دیموکراسـییەتە لـە بەڵـژیکاداو، لەبەرامبەریـشیدا خـۆیی وەك نموونەیـەکی زۆر تایبەتمەنـدی گـەل دەخاتـە روو، وەکـو قارەمـانێکی دیموکراسـیی کـە لایـەنگیری تـەواو لـە راپرسـییی‌و چاکـسازیی پەرلـەمانیی‌و زۆر شـتی تـری لـەو بابەتـەوە دەکـات. (فلامـز بلـۆك) پـشتگیریی دابەشـبونی ئاسایـشی گـشتیی (سۆشـیاڵ) دەکـات وەلێ، ئـەوە رەتدەکاتـەوە کـە ئـەم هەڵوێـستەی نیـشانەی فەرامۆشـکردن‌و پشتگوێ خستنی فەرەنسیزمانەکان بێت- بگرە، بە پێچەوانەوە، بـە بۆچـوونی ئـەوان گۆڕانکارییـەکی لـەو شـێوەیە دەبێتـە هۆکـارو یاریدەدەر بۆ ئەوەی فرانکفۆنەکان پتر بەرپرسیار بکرێن‌و، لـەماوەی دووریشدا بەسوودو قازانجی هەمووان دەگەڕێتەوە.

ئامـانج‌و مەبەسـتی (فلامـز بلـۆك) لـە پێکهێنـانی ویلایـەتێکی سەربەخۆی فلەمیشیدا، بەهـەرحاڵ، ئەگـەری سـەرکەوتنی بـۆ نییـە، لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:-

١. برۆکـسل بـە زۆرینـە بەرفرەوانـە فەرەنـسیزمانەکانییەوە لـەوە دوورتـرە کـە قوتبـدرێت بـەڵام، لەبـەر هۆکارگـەلی تایبـەتیی‌و

مێژوویی ناشکرێ (موستەحیلە) دەستی لێهەڵبگیرێت و فەرامۆش بکرێت.

٢. جودابوونەوەی ویلایەتەکە لەوانە نییە لەلایەن هاوپشکە (هاوپەیمان) ئەوروپاییەکانی بەڵژیکاوە پێشوازیی لێبکرێت.

٣. فلەمیشییەکان بە تەواوەتی دامودەزگەکانی هەرێمەکەی خۆیانیان کۆنترۆڵکردووەو، دەتوانن هێزو دەسەڵاتی زۆرتر لەسەر ئاستی نیشتمانییدا بەکاربێنن، ئەمەیش وەك دەرەنجامی زۆرینەییان لەرووی ژمارەوەو، هەروەها:

٤. مانەوی هەستی ئینتیماو ولاتپارێزیو نووسان بە بەڵژیکاوە لەنێو هەریەك لە فلەمیشیو فەرەنسیزمانەکاندا هەر بەهێزو بەردەوام دەمێنێتەوە،سەرەڕای، یاخود لەوانەیە لەبەر پرۆسەی چڕو لە ئەندازە بەدەری لامەرکەزییەت بێت کە لەلایەن دەستەی هەڵبژاردەو پێشڕەوەکانییەوە نەخشەڕێژیو جێبەجێکردنەکەی ئەنجام دەدرێت.

٤- ژێدەرو سەرچاوە بۆ زانیاریی پتر

1- Deprez, KAS and LOUIS VOS (eds), Nationalism in Belgium. Shifting Identities. 1780- 1995. New York: st: Martin][pok's Press 1998.

2- Fitzmaurice, John. The Politics of Belgium, London, Hurst, 1996.

3- Jacobs, Dirk and Marc Swyngedouw, Territorial and Non territorial Federalism: Reform of the Brussels capital Region, 2001, Regional and Federal Studies, Vol. 13, No,2 (2003)

4- MC Rae, Kenneth D., Conflict and Compromise in Multilingual Societies, Belgium, Waterloo, On: Wilfrid Laurier University Press, 1986.

وهی تریش

**خشتەی (١)**

**هێما رامیاریی و جیوگرافییەکان**

| | |
|---|---|
| شاری پایتەخت | برۆکسل Brussels |
| ژمارەو جۆری یەکە پێکهێنەرەکان | ٢ هەرێم: هەرێمەکانی فلەمیشی، والوونیاو برکسل (هەرێمی پایتەخت)<br>٢ کۆمۆنە: کۆمۆنەکانی فەرەنسی، فلەمیش و جەرمانیی. |
| زمانە فەرمییەکان | زمانەکانی هۆڵەندیی، فلەمیشی، فەرەنسیی و جەرمانیی. |
| رووبەر | ٣٢٥٤٥کم٢ |
| رووبەری گەورەترین یەکەی پێکهێنەر | هەرێمی والوونیا ١٦٨٤٥ کم٢ |
| رووبەری بچووکترین یەکەی پێکهێنەر | هەرێمی برۆکسلی پایتەخت ١٦٢ کم٢ |
| سەرجەم دانیشتوانان | ١٠,٣٢٠,٠٠٠ کەس (ساڵی ٢٠٠٢) |
| رێژەی سەدی دانیشتووانانی یەکە پێکهێنەرەکان ٪ | هەرێمی فلەمیشی ٥٧,٩٪، والوونیا ٣٢,٦٪، برۆکسلی پایتەخت ٩,٥٪ |
| سیستمی رامیاریی– فیدرالی | فیدرالیی پەرلەمانتاریی دیموکراسی، لەژێر سایەی پاشایەتی دەستوورییدا |
| سەرۆکی دەوڵەت– فیدراڵ | شاە ئەلبەرتی دووەم |
| سەرۆکی حکومەتی فیدرال | سەرەکوەزیران (گەی ڤێر هۆفشتاد (٢٠٠٣)، فلەمیشییە لیبرالیەکان و دیموکراتەکان. سەرکردەی ئەو حزبەی زۆرترین کورسییەکانی بەدەستهێناوە، یاخود سەرکردەی هاوپەیمانیی |

| | |
|---|---|
| زۆرینـــەی پەرلـــەمان لەلایـــەن پادشـــاوە بـــە سـەرەکوەزیران دادەنرێـتو دوواتـر پەرلـەمان پەسەندی دەکات. تێبینی: پێوسیتە کابینەکە لـەژمارەی یەکسان لــە فەرەنــسیزمانو هۆڵەندیزمانــەکان پێــك بهێنرێت. تێبینـــی: لـــە (١٣ی تـــەمووزی ٢٠٠٢)ەوە (VLD- فلەمیــــــشییە لیبرالــــــەکانو دیموکراتــەکان) حکومــەتێکی هاوبەندییــە لــە ئەنــدامانی هــەر یــەك لــە (VLD)، (بزاڤــی چاکسازیخوازان RM)، (سۆشیالیـست پـارتی ئەنــــدەرز SPA)و سۆشیالــــست پــــارتی دیفێرەنـــتو ســپیریت (SPA- Spirit)و هەروەها پارتی سۆشیالست PS) پێکهاتووە. | |
| جوت پەرلەمانیی Upper House ئەنجومەنی باڵا- سینات: ٧١ کورســــیی، ٤٠ چـــــلیان راســــتەوخۆ هەڵبــــژێردرێنو، ٢١ بیــــستویەکیان لــــە ئەنجومەنــــەکانی کۆمۆنەکانــــەوە دەهێنــــرێن (وەردەگیرێــن)- ١٠ دەیــان لــە هەریــەك لــە ئەنجومەنی کۆمۆنەی فلەمیشیو فەرەنسییو ١ یەکێکیــشیان لــــە ئەنجومــــەنی کۆمۆنــــەی جەرمانییــەوە (١٠) دەی دیکەیــشیان لەلایــەن ســــیناتۆرەکان خۆیانـــــەوە دادەنــــرێن. | بونیــاد- پێکهاتــەی حکومــەت- فیدرال |

| | |
|---|---|
| | سیناتۆرەكان ماوەی چوار ساڵ دەمێننەوە.<br>ئەنجومەنی پایین Lower House: خانەی نوێنەران، ١٥٠ كورسیی هەیە، ئەندامانی (٦٢ فەرەنسیزمانو ٨٨ هۆڵەندیزمان بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆو بە سەرپەرشتیی نێودەوڵەتیی لەسەر بنەمای نوێنەرایەتیی ڕێژەیی هەڵدەبژێردێن بۆ خولێك كە ماوەكەی لەچوار ساڵان زیاتر نەبێت. |
| ژمارەی نوێنەران لە ئەنجومەنی پایینی سەر بە حكومەتی فیدراڵ لە یەكەی پێكهێنەری خاوەن زۆرترین دانیشتوان | هەرێمی فلەمیشی– ٧٩ كەس |
| ژمارەی نوێنەران لە ئەنجومەنی پایینی سەر بە حكومەتی فیدراڵ لە یەكەی پێكهێنەری خاوەن كەمترین دانیشتوان | هەرێمی برۆكسلی پایتەخت– ٢٢ كەس |
| دابەشكردنی دەسەڵاتەكان | دەسەڵاتەكانی حكومەتی نێوەندیی (فیدڕاڵ) ئەم بابەتانەی خوارلوە دەگرێتەوە:<br>ئاساییشی كۆمەڵایەتیی (سۆشیاڵ)، یەكێتی ئابووریی، سیاسەتی پارەو دراو، گومرگو باج، بەرگریی‌و كاروبارە نێودەوڵەتییەكان، بازرگانیی دەرەكی، سیاسەتی زانستیی، كۆچو ئاوارەیی، كاری بانك، پارە لێدان، بیمە (تەئمین)، هێڵی ئاسن، پێوەندییەكانو |

| | |
|---|---|
| | گەیاندن، بیمەی لەشساخیی، قەردی گشتی، باساو بڕیار، هەرێمەکانیش دەسەلاتی سەرپەرشتی کردنی ناوچەکانو شارەوانییەکان پیادە دەکەن بێجگە لە دامەزراندنی حاکمی (پارێزگاری) ناوچەکانو (عومدەکان)، هەروەها بێجگە لە دانانی پرەنسیپو رێنماییگەلی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکان بۆ هێزەکانی پۆلیسی شارەوانییەکان چونکە ئەوانە بە بەشێك لە دەسەلاتی فیدراڵ (نێوەند) دا دەژمێردرێن.<br>کەچی هەرێمەکان لە بنەڕەتەوە بەرپرسیارن لە کاروبارە کۆمەلایەتی- ئابوورییەکان ·واتە: پلاندانانی شارستانیی، خانووبەرەو نیشتەجێکردن، ژینگە، پەرەپێدانی ئابووریی، دامەزراندن)و، کۆمۆنەکانیش بەرپرسیارن لە پەروەردە، کاروباری رۆشنبیریی (کولتووریی)و بایەخدان بە تەندروستیی (بێجگە لە بیمەی تەندروستیی). |
| دەسەلاتەکانی تر: | ئەو دەسەلاتانەی کە دەمێنێتەوە بۆ حکومەتی فیدراڵ دەگەڕێتەوە. |
| دادگەی دەستووریی (بالاترین دادگەیە کە لە بابەتە دەستوورییەکان دەکۆلێتەوە | کۆر داربیتراج (Cour d'arbitrage) دوانزە دادوەرن. پێکهێنان لەسەر بنەمای رەچەلەکی زمانەوانیی (هۆلەندیی‌و فەرەنسیی) دەبێت. دادگەکە دوو سەرۆکی هەنە، یەکێك لە |

| | |
|---|---|
| | کۆمەڵگەی فەرەنسیو ئەویتر لە کۆمەڵگەی هۆڵەندییو، سەرکردایەتییەکە بە نۆرە دەبێت. |
| سیستمی رامیاریی یەکە پێکهێنەرەکان | کۆمەڵگەلی فلەمیشی، فەرەنسییو جەرمانیزمان، هەرێمەکانی والوونیاو برۆکسلی پایەتەخت هەر یەکیان ئەنجومەنێکی یاسادانانو دەستەیەکی جێبەجێکردنیان هەیە کە لەلایەن ئەنجومەنەکانەوەو لەخۆیانەوە هەڵدەبژێردرێن. |
| سەرۆکی حکومەتی یەکە پێکهێنەرەکان | ئەنجومەنەکانی یاسادانانی هەرێمایەتی، ئەندامەکانیان راستەوخۆ بۆ خولێکی پێنج ساڵی هەڵدەبژێردرێن. دەسەڵاتی جێبەجێکردنیش لەدەست حکومەتی هەرێمدایە. |

**خشتەی دوومم (٢)**

**هێماو ئامارە ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکان:**

| | |
|---|---|
| کۆی گشتی داهاتی (GDP) ساڵانە | ٢٧٥,٥ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی (٢٠٠٢) |
| پشکی تاك لە داهات | ٢٦,٦٩٥ دۆلاری ئەمریکی (٢٠٠٢) |
| قەرزی نیشتمانیی (دەرەوە) | ٢٨,٣ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی (١٩٩٩) |
| قەرزی لاوەکیی نیشتمانیی | ١١,٤ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی. (حوزەیرانی ٢٠٠٣) |
| رێژەی بێکاریی نیشتمانیی | ٧,٦٪ ساڵی (٢٠٠٢) |
| یەکەی پێکهێنەری خاوەن بەرزترین رێژەی بێکاریی | هەرێمی برۆکسلی پایەتەخت- ١٦,٤٪ . |
| یەکەی پێکهێنەری خاوەن | هەرێمی فلاندەرز- ٥,٤٪ |

سیستمی فیدرالی لەچەند وڵاتێکی جیهاندا ٢٠٠٥

| | |
|---|---|
| نزمترین ڕێژەی بێکاریی | |
| ڕێژەی خوێندەواری هەرزەکاران (تەمەنی سەرووی ١٥ ساڵ) | ٩٩٪ |
| خەرجی نەتەوەیی لەسەر پەروەردە وەك ڕێژەی سەدی لەداهاتی گشتییدا | ٥,٩٪ |
| هیوای ژیان بەساڵ | ٧٨,٥ ساڵ (٢٠٠١) |
| داهاتی حکومەتی فیدڕال لە گومرگو سەرچاوەگەلی هاوپێوەند | ٦٤,٩ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی (٢٠٠٢) |
| داهاتی یەکە پێکهێنەرکان لە گومرگو سەرچاوە هاوشێوەکان | ٥,١ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی (٢٠٠٢) |
| یارمەتیەکانی فیدڕال بۆ یەکە پێکهینەرەکان | ٢١,٢ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی (٢٠٠٢) |
| میکانیزمەکانی هاوسەنگیی (یەکسانیی) کردن | بەخششێکی بێ مەرج بە هەرێمەکان دەبەخشرێت تاوەکو کۆی (معدل). داهاتی تاکەکانیان لەسەرچاوەی باجو گومرگ بۆ ئاستی کۆی نەتەوەیی (نیشتمانیی) بەرزببێتەوە. |

# ئەفریقیای باشوور

نووسینی، جانیس ڤاندیر وێستهویزن (janis Van Der Westhuizen)

## ١- دیرۆكو پەرەسەندنی فیدرالیزم

ئەفریقیای باشوور كەوتۆتە گۆشەی هەرەخوارووی كێشوەری ئەفریقیاوەو فەرمانڕەوایی بەسەر هەرێمی باشووری ئەفریقادا دەكاتو (نامیبیا، بۆتسوانا، زیمبابۆیىو مۆزنبیق) هاوسێی هەرە نزیكەكانیىو خۆیشی بەتەواویی دەوری (سوازیلاندو لیزۆتۆ)ی داوە.

رووبەرەكەی (١,٢١٩,٠٩٠) كیلۆمەتر دووجاو ژمارەی دانیشتووانەكانی دەگاتە نزیكەی (٤٢) چلو سێ ملیۆن كەس. لەسالآنی نەوەدەكان ٧٥,٢٪ لەسەدا حەفتاوپێنجو پۆینت دوویان رەشپێستو لەسەدا ١٣,٦٪ سپیو ٨,٦٪ رەنگ پێستو ٢,٦٪ یان هیندیی بوون.

چەمكی فیدرالیزم لە ئەفریقیای باشووردا پێشترێشو ئێستەیش زۆر برەوی هەیە، بەلەبەرچاوگرتنی بە قوولیی دابەشبوونی لەمێژینەی رەوتی سیاسەتكردنی ولآتەكەوە.

چوار ناوچەو هەرێمی بەریتانیایی– موستەعمەرەی کاپ، the Cape Colony وناتال (پێشتر لەژێر کۆنترۆلی بەریتانیادا بوو)، کۆمارەکانی (بوێر) لە ترانزڤائالو دەوڵەتی ئازادی ئۆرەنج– بەپێی (قانوونی ئەفریقیای باشوور) کە ساڵی ١٩٠٩ پەرلەمانی بەریتانیا دەریچواند یەکیانگرتەوە. لەمانگی ئایاری ١٩١٠دا ئەفریقیای باشوور بووە دۆمینیۆنێکی خودموختار لەنێو کۆمنۆیلسی بەریتانیاییدا.

یەکگرتنەوەکە چارەسەرێکی مامناوەندیی بوو: بەلای ئەفریکانۆکانەوە ئەوە سەربەخۆیی زیاترو بێهێزکردنو کەمکردنەوەی دەسەلاتەکانو کاریگەریی ئیمپریالزمی بەریتانیی دەگەیاند، بەریتانیاییەکانیش پێیانوابوو یەکێتی یەکە کاریگەریی ئەمان بەهێزترو پتەوتر دەکاو دەسەلاتەکانیان دەچەسپێنێ. لەسەرەتادا یەکگرتنی ساڵی ١٩١٠ ئەفریقیای باشوور بەروونی گشت بەهانەکانی فیدرالیزمی رەتکردنەوە. لەوکاتەدا یەکێتییەکە وەك پێکهاتنو رێکخستنەوەی بەرژەوەندیی ئەفریکانۆکانو بەریتانییەکان سێبەری خۆی خستبووە سەر پێوەندییە نەژادییەکانی نێوان سپیەکانو رەشپێستەکانەوە. لەراستییدا، پرۆسەی دامەزراندنی یەکێتییەکە یارمەتیدەری هێرشە درێژخایەنەکە بوو لەدژی مافە سیاسییەکانی ئەفریکانۆ رەشپێستو رەنگاورەنگەکانی ئەفریقیای باشوور. ئەگەرچی یەکێتییەکە سەرەتاییەك بوو بە ئاراستەی

یەکخستنەوەی بەرژەوەندییەکانی ئەفریکانۆکانو بەریتانییەکان، بەلأم نەیتوانی ئەفریقیای باشوور (یەکگرتوو) بکات چونکە زۆرینە رەشپێستەکان لەبەشداریکردن لە سیاسەت بەدەرنرابوون. ئەمەیش دواتر هەتا سالأکانی نەوەدەکان لەمێژووی ئەفریقیای باشووردا رەنگیداوەتەوە.

بە پەیدابوونی دەولەتی خاوەن سیاسەتی رەگەزپەرستییو جیاکاری دژی رەشپێستەکان سالی ١٩٥٠ دەسەلأت تا دەهات زیاتر لەچوار دەڤەرەکانی (ترانزڤائال، ئورێنج فری ستەیت، نتالو کاپ)دا کۆدەبۆوە کەبەشێوەی یەکەگەلی ئیداریی تایبەت بە (سپی پێستەکانی) ئەفریقیای باشوور بوونیان هەبوو. نیشتمانە نەژادییەکان کەبە (بانتوستان) ناودەبران، هەروەکو داگیرکراوی دەستووریی یان پاشکۆی ناسەرەکیی سەیردەکران لەچوار (ویلایەتی بەناو سەربەخۆ) پێکهاتبوو ئەویش برێتیبوون لە (بۆفوتسوانا، ڤێندا، سیکایو تراتسکای)، سەرباری شەش (ناوچەگەلی خودموختار) ئەم قەوارانە لەسەر دلی ئەوە راوەستاون کە بە (ئەپارتایدی مەزن) ناوبانگی دەرکردبوو، چونکە لەرێگەی ئەم دەڤەرانەوە هێلە خێلەکییەکان دیاریکرابوون کە وادانرابوو گوایا رەشەکانی ئەفریقیای باشوور بۆیان هەبوو مافە شارستانییەکانو مافی دەنگدانیان تیادا پیادە بکەن، لەراستییدا واتای ئەوەبوو کە کەمێك زیاتر لە کرێکارە

میوانەکان) ئەوانەی بەشێوەیەکی کاتیی لە ئەفریقیای باشووری (سپی)دا نیشتەجێبوون سوودیان لەو مافانە وەردەگرت.

سەرباری (گراند ئەپارتهاید) (پیتی ئەپارتهایدی بچووك) کە برێتی بوو لە تۆڕێکی بەربڵاوی کۆنترۆڵی دەوڵەتو بەو هۆیەوە هەموو لایەنێکی ژیانی رۆژانە لەنێوان رەگەزە جیاوازەکانی دانیشتووی ئەفریقیای باشووردا لێك جوداکرابوونەوە– کە ئەمانەی دەگرتنەوە: گواستنەوە، شوێنەکانی نیشتەجێبوون، زانکۆکان، دەروازەی دوکانەکان، شوێنە گشتییەکانی رابواردنو کات بەسەربردنو تەنانەت سێکسو هاوسەرگیریش.

بەهەرحاڵ، تەنها نرخێك کە هەولێکی ئاوەها چڕ لەسەر ئەندازەی کۆمەڵایەتی لەتەك بێ توانایی رژێمی فەرمانڕەواییدا بۆ (فەراهەمکردنی دەرفەتە جوداواز بەڵام یەکسانەکانی) ژیان بۆ رەشپێستەکانی ئەفریقیای باشوور سەرەنجام بە دارمانیو (سەرنەگرتنی) سیاسەتی (ئەپارتهابد) کۆتایی هات.

پرۆسەی شارنشین کردن بەهەمان هێز بەردەوام بوو کە بەهۆیەوە بیرۆکەو چەمکی گراند ئەپارتهایدی کردە تەنها ئەندێشەو چیرۆکێکی خەیاڵی.

جا، کە دانیشتوانە رەشەکانی ئەفریقیای باشوور گیرۆدەی هەژاریی، بێکاریيو خواستی سەرفرازیی بووبوون، نارەزایی

کۆمەڵایەتی بەدرێژایی ساڵەکانی شەستەکان و حەفتاکان و هەشتاکان بوونە هۆی ریسواکردنێکی نێونەتەوەیی و لاتەریك خستن و ئابلوقە لەسەر دانان کە دەرەنجام کزبوونی گەشەسەندنی ئابووری لێکەوتەوە. بۆ رووبەڕووبوونەوەی بارنەی نارەزایی نێودەوڵەتیی، بێکاریی و هەڵچوونی کۆمەڵگە، ئێف. دەبلیو. دی کلێرك F.W. De Klerk دوا سەرکۆماری دەوڵەتی ئەپارتهاید قەدەغەی لەسەر کۆنگرەی نیشتمانیی ئەفریقایی (ANC)و بزووتنەوە جەماوەرییە سیاسییەکانی دیکەی هەڵگرت. ئەمەش پرۆسەیەکی هێنایە ئاراوە کە ئازادکردنی نلسون ماندێلای لە بەندیخانەو گفتوگۆی بەئاراستەی دەستوورێکی کاتیی و هەڵبژاردنی دیموکراتیی لێکەوتەوەو دەرەنجام حکومەتێکی هاوپەیمانیی لەژێر دەستوورە کاتییەکەدا دامەزرێنراو، پەرلەمانێکی بەدیموکراتیی هەڵبژێردراوی وەك ئەنجومەنێکی دەستووری لێ هاتەکایەوە بۆ ئەوەی دەستوورە نوێیەکە دەربچوێنێت و لە ساڵی ١٩٩٦دا دەستوورێکی تازە پەسەند بکات.

گریمان سیاسەتی ئەپارتهاید، هەندێکی لەسەر شێوەیەکی فیدرالیستیدا پاساوی هەبووبێت، ئەوا فیدرالیزم سەرباری هەندێ نارەزایی لەلایەن زۆرانەوە، هەر بەچاوی پرپایەخەوە سەیرکراوە لەماوەی قۆناغی گواستنەوەی رامیاریی ئەفریقیای باشووردا لەسەرتای نەوەدەکاندا. بەتایبەتی ئەندامانی (ANC) چەند

پێشنیازیان بۆ حکومەتی بەهێزی هەرێم وەك شێوەیەك لە ئەپارتهایدی تازەبابەت لێکدایەوە، بەتایبەتیش چونکە حزبی نیشتمانیی دەسەڵاتدار بووە گەرمترین پاڵەوانی فیدرالیزم لەگەڵ هەڵمەتی گۆڕانەکەدا. پارتی (ANC)و هاوپەیمانەکانی لەوە دەترسان سیستمێکی فیدراڵیی بە پێدانی دەسەڵات بە ناوچەکان بۆی هەبێ دەسەڵات بەشێوەیەکی دیار پەرش‌و بێ‌هێز بکات، بەوەیش توانای حکومەتی ناوەند بۆ خستنەکاری میکانیزمەکانی دروستکردنەوەو پەرەپێدانی سەردەمی دوای ئەپارتهاید زۆر کەمکاتەوە.

پشتیوانی لێکردنی فیدرالیزم لەزۆر لایەنانەوە هات. بێجگە لە حزبی نیشتمانیی‌و حزبی دیموکراتی کە پارتێکی لیبراڵ دیموکرات بوو، پارتی ئازادیی ئینخاتا (Inkhata Freedom Party) کە هەمیشە خۆی وەك تاکە پارێزەرو بەرپرسی بەرژەوەندییە سیاسییەکانی گەلی (زۆلۆ)- (Zulu) دەناسێت، ئەمیش داوای خودموختارییەکی پەرەسەندووی دەکرد بۆ هەرێمی (کوازولو-ناتاڵ) (Kwazulu- Natal) کە (زولوەکان) تیایدا زۆرینەی ئەتنی پێکدێنن‌و تەنانەت داوای مافی بڕیاردانی چارەنووسیشیان کردووە. بەهەمان شێوە، گروپێکی بچکۆڵانەی ئەفریکانێری رادیکاڵی کە خوازیاری مافی زیادەن بەدەنگی بەرز دروشمی دروستکردنی

(ڤۆلکشتات) یان وەك نیشتمانێکی تایبەت بە ئەفریکانۆ سپی پێستەکان بەرزکردبۆوە. لە راستییدا، لەیەك نزیکبوونەوەو یەکگرتنەکە- وێڕای جوداوازیی بەرچاوی بیروباوەڕ (ئایدیۆلۆژیی) نێوان پێکهاتەکان سەبارەت بە بەرژەوەندییەکانیان لە ئۆتۆنۆمیی دا، سەرەنجام هاوپەیمانییەتێکی نامەرکەزیی رێکوپێکی لەماوەی پرۆسەی گفتوگۆکاندا لێکەوتەوە کە بووەهۆی پەرەپێدان‌و زیادبوونی توخمەکانی فیدرالیزمیی لە دەستوورەکەی ئەفریقیای باشووردا. لە هەمووشی گرنگتر، پارتی نیشتمانیی- نوێنەری زۆرینەی سپی پێستەکان‌و (رەنگ پێستەکانیش کە تا دەهات زیادی دەکرد)، وای بۆ دەچوو کە فیدرالیزم‌و لەگەلیشیدا قانوونی مافەکان چاویدێرو جلەوگیرێکی گرنگ دەخاتە سەر زێدەڕۆیی‌و خراپ بەکارهێنانی هێزو دەسەڵات لەڕێگەی حکومەتێکی تازەی زۆرینەوە.

پرۆسەی وتووێژەکان کە بە توندیی دوژمنایەتیی‌و هەڕەشەی راگرتنی لێدەکرا، سەرەنجام تەنگوچەڵەمەکە- کە بە پێشنیازێکی (ئاداری ساڵی ١٩٩٣) دامرکایەوە، کە لە (راپۆرتێکی متمانەیی بۆ پارتییە سیاسییەکان) داهاتبوو کە (بزاڤی راوێژکاریی بازرگانیی) ئامادەو پێشکەشی کردبوو. پێشنیازەکە (٣٤ پرنسیپە دەستوورییەکان)ی خستبوونەڕوو بۆ ئەوەی ئەنجوومەنی دەستووریە بەشێوەیەکی دیموکراسیی هەڵبژێردراوەکە پەیڕەویان لێ

بکات لەکاتی دانانی دەستووریی کۆتاییدا. هەرە گرنگترینیان داواکاریی لە هەردوو ئاستی حکومەتە (نیشتمانیی و هەرێمایەتی) لەخۆگرتبوو کە هەردوو دەسەلاتە تایبەتەکان و گشتگیرو دەسەلاتە هاوبەشەکان هەبێت (پرەنسیپی ١٩)و لەهەمان کاتدا، رووناکیی زۆری دەخستەسەر پرەنسیپیی یاردیدەریی ئەوەی دەڵێت بڕیارەکان پێویستە لەسەر هەر ئاستێك کە هەرە (بەرپرسیارو پاساو دراوە) وەربگیرێن (پرەنسیپی ٢٠).

زۆربەی توێژەرەکان وایدەبینن کە دەستووری ئەفریقیای باشوور بەشێوەیەکی سەرەکیی فیدرالییە بەتایبەتی لەسەر شێوەی مۆدیلی فیدرالیزمی یەکگرتووی جەرمانیی (ئەلمانیی) دارێژراوە کە چوارچێوەیەکی یاسایی و یەکگرتنێکی یەکسانی نەختێ توندوقوڵی لەنێوان حکومەتەکانی نێوەندو هەرێمەکاندا هەیە لەرێگەی بوندستراتBundestrat)ەوە جێبەجێکراوە، بەواتایەکی تر، ئەگەرچی هەرێمەکان بەتەواویی بەشداریی لە دارشتنی ئەو سیاسەتانە دەکەن کە پێوەندیان بەناوچەکانەوە هەیە، بەلام بڕیاری کۆتایی هەر بۆ حکومەتی ناوەندیی دەگەڕێتەوە.

**٢- مەرج و بەندە دەستوورییەکانی پەیوەست بە فیدرالیزم )**

کۆماری ئەفریقیای باشوور دیموکراتیەتێکی پەرلەمانتارییە کە سەرۆکێکی هەیە سەرۆکی حکومەت و لەهەمان کاتدا سەرۆکی دەوڵەتیشە.

ئەو سیستەمە سەرۆکایەتییە پەرلەمانتارییە تێکەڵاوە و دەستوورەکەی لە ١١ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٦دا کاری پێکراوە. دەستوورەکەی ساڵی ١٩٩٦ دابڕانێکی یەکلایەنەی تەواو بوو لە پرەنسیپی دەسەڵاتدارییەتی پەرلەمانیی سەر بە بەریتانیاوە، ئەوەیش بۆ دەستنیشانکردنی ئەو سنوورانە دەگەڕێتەوە کە دەستوورەکە سەپاندوویەتی.

دەستووری ئەفریقیای باشوور (بەتایبەتی قانوون و لیستی مافەکان) بە یەکێك لە هەرە پێشکەوتخوازەکان لە دنیادا دەژمێردرێت.

ژمارەیەك بەندی تایبەتی بۆ چەندین کۆمیسیۆن و فەرمانگەکان دادەنێت (بەشی ٩)، کە ئەمانە دەگرێتەوە: ووردبینی گشتیی (بەشی ٢٨٨) پارێزەر یان (وەسیی) گشتیی (بەشی ١٨٢)، کۆمیسیۆنی مافەکانی مرۆڤ (بەشی ١٨٤)، کۆمیسیۆنی یەکسانیی نێرومێ (بەشی ١٨٧)، کۆمیسیۆنی سەربەخۆی هەڵبژاردن (بەشی ١٩٠)، کۆمیسیۆنێك بۆ پەرەپێدان و پاراستنی مافەکانی کۆمەڵە کەلتوورییی،

ئایینی‌و زمانییەکان (بەشی ١٨٥)، هەروەها دەسەڵاتی سەربەخۆی پەخش‌و بڵاوکردنەوەی رادیۆو تەلەفزیۆن (بەشی ١٩٢).

بەپێی دەستوورەکەوە یەکێتییەکی فیدرالیی لە نۆ یەکەی پێکهێنەر دامەزرێنراوە کە ئەم دەڤەرانەن: (کوازولو- ناتاڵ، گاوتینگ، فریی ستەیت، کاپی خۆرئاوا، کاپی خۆرهەڵات، لیمپۆپۆ، خۆرئاوای باکوور، کاپی باکوورو میومالانگە (بەشی ١٠٣).

جیا لە زۆربەی فیدراسیۆنەکان لە دابەشبوونی قووڵی کۆمەڵگەکاندا، تخووبە هەرێمایەتییەکان لەسەر بنەمای تخووبی خێڵەکی یان رەگەزایەتی نەکێشراون، بگرە پێویستییە سیاسییەکان رەچاوکراون بۆ دووبارە نەبوونەوەی تاقیکردنەوە هاوشێوەکانی رابردوو.

دەستوورەکە دان بە حکومەتەکانی سێ ناوچەی دەسەڵات دادەنێت (بەشی ٣)ی دەستوورەکە بەکارهێنانی زاراوەی (ئاستی حکومەت)ی رەتکردەوە. بە رەسمیی ناسینیی حکومەتی خۆجێییی وەك ناوچەیەکی دەسەڵاتی دەستووریی لە ئەفریقیای باشووردا جیاوازیی هەیە لەگەڵ نموونەکانی زۆران فیدراسیۆندا، ئەوانەی حکومەتە خۆجێییەکانیان دەکەونە بەر حوکم‌و دەسەلاتی یەکە پێکهێنەرکانەوە.

دەستوورەکەی ١٩٩٦ بۆ ئەوە داهێنراوە کە زیاتر پەرە بە مۆدیلێکی فیدرالیزمی هەرەوەزیی بدات تا یەکێکی بەربەرکانێو رکابەر. بۆیەکا حکومەتە ناوچەییەکان داوایان لێدەکرێت بەگوێرەی دەقو رۆحی پرەنسیپەکانی حکومەتی هەرەوەزیی رەفتار بکەن وەك لە بەشی (بەند)ی ٣ی دەستوورەکەدا هاتووە. لەیەك جوداکردنەوەیەکی چەسپاوی کارو ئەرکەکان لەنێوان مەودای دەسەلاتەکانی حکومەتدا بوونی نییە ئەمەیش بەروونیی لەلایەن (ئەنجومەنی هەرێمەکان)ەوە پێشنیاز کراوە، کە بەرژەوەندییەکانی حکومەتی نیشتمانیی‌و هەرێمایەتی‌و خۆجێییەتی تیایدا یەکدەگرنەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا پرەنسیپی حکومەتی هەرەوەزیی زیان بە ئۆتۆنۆمی هەرێمایەتی ناگەیەنێت. بۆ نموونە هەردوو هەرێمی (کاپی خۆرئاواو کوازولوناتال) مافی دارشتنی دەستووری تایبەتی هەرێمایەتی خۆیانیان بەکاربردووە (بەشی ١٠٤) ئەوەیش تەنها بە پەسەندکردنی پێشەکی لەلایەن (دادگەی دەستووریی)یەوە (بەشی ١٤٤). تەنانەت، دەبێ ئەوەیش بزانرێت کە دابەشکردنی مافی پێدانی دەسەلات لە حکومەتی نێوەندەوە کە پێوانەو نموونە گشتییەکان دادەنێت‌و لەوانەیە پێوانە نموونەییەکانی هەرێمایەتی، کە دەبێتە مایەی هەرەشەکردن لە یەکێتی نیشتمانیی‌و پێوانە نیشتمانییەکان،

پووچەلکاتەوە. لیستێکی ئێجگار کورتی دەسەلاتە تایبەتییەکانی هەرێمایەتی هەیە، وەك (کوشتارگەکان (قەسابخانە)، پلاندانانی ناوچەیی، رێگاوبان، وەرزش، کاروبارەکانی سەر بە کەلتووروڤیتێرنەریی– خزمەتگوزاریی بەیتەریی–) لە بوارە هەستیارترەکانی تردا دەسەلاتەکان هاوبەشن‌و بەم شێوەیە هەردوولا بۆیان هەیە یاساسازییان بۆ بکەن هەرچەندە هەمدیس قانوونی نیشتیمانیی (فیدرالیی) سەرپشکە لەو بابەتانەدا کە ناتوانرێ بەشێوەیەکی کاریگەرانە لەلایەن هەرێمەکانەوە بەرێوەببرێن، یان پێویستییان بە یەکجۆریی‌و نەگۆڕان هەیە بۆ ئەوەی کاریگەر بن.

ئەفریقیای باشوور پەرلەمانێکی جووت ئەنجومەنیی هەیە لە (ئەنجوومەنی نیشتمانیی) و (ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمەکان) پێکهاتووە کە بارەگای هەردووکیان لەشاری کێپ تاون ( Cape Town) دان (بەشی (٦) ٤٢). (ئەنجومەنی نیشتمانیی)یەکە لە ٤٠٠ چوارسەد نوێنەر پێکدێت کە لەسەر بنەمای نوێنەرایەتی رێژەیی‌و سیستەمی لیستی پارتایەتی هەلدەبژێردرێن (بەندی چوارەم، بەشی ٦٠–٧٢) ئەو (ئەنجومەنە نیشتمانییە) وەك ئەنجومەنێکی پلە خوارتری بە دیموکراتیی هەلبژێردراو، پێویستە لەسەری (حکومەت لەلایەن خەلکەوە لەژێر سەروەریی دەستووردا) دابین‌و مسۆگەر بکات.

شـــتێکی هەنـــدێك نائاســـاییە کـــە دامودەزگـــا کارگێڕیـــەکان‌و یاساسازییەکان لە شارگەلی جـوداوازدان، وەلێ، ئەگـەرێکی زۆر بـەهێز لەئارادایـــە کـــە (پەرلـــەمان) بـــچێتەوە بـــۆ پایتـــەختی کـــارگێڕی (بریتۆریا)وە بۆ ئەوەی خەرجییەکانی پەرش‌و بلاوبوونی پێتەختەکان کەم بکرێنەوە.

ئەنجومـەنی بالاکـە لەسـەردەمی دەسـتووری کاتییـدا پێیـدەگوترا (سـینات) (The Senate)- وەلێ لـە دەسـتوورەکەی سـالی ١٩٩٦دا نـاوی بۆتـە ‹ئەنجومـەنی نیـشتمانیی هەرێمـەکان›. ئـەم ئەنجومەنە لە (٩٠) نەوەد ئەندام پێکدێت نوێنەرایەتیی بەرژەوەندییە تایبەتەکانی هەر (٩) نـۆ هەرێمـەکان دەکـەن‌و بەتـەنگ ئـەوەوەن کە دلنیابن ئەم بەرژەوەندییانە لەلایەن حکومەتی ناوەندەوە زیانیان پـێ ناگـات (بەشـی ٤٢/٤) ئەوەنـدەی پێوەنـدیی بـە کاروبـاری داراییـەوە هەیـە هەرێمـەکان بۆیـان هەیـە پـشکی داهـاتی بـاج‌و گـومرگی میریـی دیـاریکراوی خۆیـان زیـاد بکـەن، هـەروەها دەسـەلاتی وەرگرتنـی زۆر کـــەم قـــەردیان پێـــدراوە (بەشـــی ٢٣٠). یاســـا بنەڕەتییـــەکان لـــە دەســـتوورو هـــەروەها لـــە (قـــانوونی پێوەندییـــە داراییـــەکانی نێـــوان حکومەتەکانـدا) چەسـپێنراون کـە یەکـەمجار لـە بوودجـەی سـالی ١٩٩٩دا کـاری پێکـرا. فیـدرالیزمی دارایـی لـەبواری دابەشـکردنەوە ئێجگـار مەرکەزییـەت پێـڕەو دەکـات، بـە رەچـاوکردنی فاکتەرگـەلی

دارایــی وەك پێداویــستییەکانی حکومــەتی نیــشتمانیی (نێوەنــدیی)و هێزی چەکداری حکومەتە ناوچەییەکانو هەروەها پێویستیی زاڵبـوون بەســەر نایەکــسانیی دەســکەوتو داهــات (لــەنێوان هەرێمــەکان)دا. (بەشــی (g) (۲)/ ۲۱٤). (کۆمیــسیۆنی ســامانو داریــی) بــۆ ئــەوە دامەزرێنراوە تا ڕێنمایی لەمەڕ دابەشکردنی بودجەوە پێشکەش بکات (بەشــی ۲۲۰). (بەشــی ۲۲۷) بـۆ هــەر هــەرێمێك بەشــێکی وەك یــەکی ڕەوا لە داهاتی نەتــەوەیی دابین دەکات کەچی، بــەپێی (بەشــی (۲) ۲۲۷) دەســتکەوتو داهــاتی زیــادەو ســەربار کــە هەرێمــەکان یــان شارەوانییەکان بەدەســتیان دێنن نابێ لـە پـشکی ئــەوان لـە داهــاتی نەتــەوەیی یــان هــەر بەشــێکی دیکــەی تـر کـە لـە داهـاتی حکومــەتی نیشتمانییەوە بۆیان بڕابێتەوە کەم بکرێتەوە.

دەســتوورەکە ڕێوشــوێنی ڕوونو ئاشــکرای تێدایــە ســەبارەت بــە چارەسەرکردنی کێشە دەســتوورییەکان (بەنـدی هەشـتەم). ســەربای پرەنــسیپی حکومــەتی هــەرەوەزکار، ســەرجەم بەشــەکانی حکومــەت لەسەریانە هــەموو توانایــەکی گونجـاو بخەنەگــەڕ بـۆ چارەســەرکردنو نەهێڵانی هەر گرفـتو کێـشەیەك لەڕێگــەی وتووێـژو گفتوگۆی نێـوان حکومەتەکانــەوە. (بەشــی (۳) ٤١)، هــەروەها بــەکارهێنانی هــەموو شــێوازێك بــەر لــە گەیانـدنی کێـشەکە بەدادگــە بـۆ یەکلاکردنــەوەی. دادگــەکان بۆیــان هەیــە ئــەو جــۆرە کێــشانە بگەڕێننــەوە بـۆ بەشــە

جوداوازەکـانی حکومـەت ئەگـەر پێیـانوابوو لـەم رووەوە هــەوڵو تەقەلای پێویست نەدراوە، (بەشـی (٤) ٤١). جـا، ئەگـەر دادگەیـەکی یاسا نـەیتوانی کێشەیەك چارەسـەر بکـات ئـەوا یاسـای نیـشتمانیی بەسـەر قـانوونی هـەرێم یـان دەسـتووری هەرێمـدا زاڵ دەبێـت لـەو حاڵەتانەدا کە ناکۆکییەکە لەسەر لێکدانەوەو بۆچوونی یاساییدا بێت. (بەشی (٣) ١٤٦، وبەشی ١٤٨).

لەگـەڵ ئەوەشـدا، دادگـەی دەسـتووریی وەك بـاڵاترین دادگـەی پەیوەست بـە کاروبـارو بابەتـە دەسـتوورییەکان، خـاوەنی دوابڕیـارە لـەبارەی ئـەو کێشانەی حکومەتـەکانی ناوەنـدو هـەرێمو خۆجێیـەتی تێیانەوە گلاون (بەشی ١٦٧). دادگەکە لـە سـەرۆکێكو جێگرێـكو نـۆ دادوەری دی پێکـدێت (بەشـی ٠١) ١٦٧)و بابەتـەکان پێویـستە لانـی کـەم ٨ هەشـت دادوەر بیـانبینن. دادگـەی دەسـتووریی بڕیـار لەسـەر ناکۆکییـــەکانی نێـــوان دەزگاکـــانی دەوڵـــەتو هـــەروەها لـــەبارەی کێـشەکانی پەیوەسـت بـە دەسـتووریی بـوونی هـەر قـانوونێکی هەرێمایـەتی یـاخود پەرلـەمانیی یـان هـەموارکردنی دەسـتوور دەدات بەشـی (٤) ١٦٧). ئـەم بابەتانـە دەکـرێ راسـتەوخۆ بدرێنـە دادگـەی دەستووریی لەلایەن هـەر کەسـێکەوە چـونکە ئـەوە لـە بەرژەوەنـدیی داد دایەو بە ئێجازەو رەزامەندیی دادگەی دەستوورییشە (بەشـی (٦)

١٦٧). ڕێبازگەلی نەگۆڕو چەسپیو دەبێ پەیڕەو بکرێن بۆ ئەنجامدانی گۆڕین‌و هەموارکردنی دەستووریی (بەشی ٧٤).

ئەم گۆڕانکارییانە دەکرێ بەگوێرەی پێنج بابەت پۆلێن بکرێن، کە پلەی چەسپیوی جوداوازیان هەنە. جا، لەبەر ئەوەی ناتوانرێت ئەمانە گشتیان لێرەدا بە دووروودرێژی باس بکرێن، بەکورتی ئاماژە بەوە دەکەین کە گۆڕین لە دەسەلأتە چەسپاوەکانی دەستوور خۆی تەنها بە یاسایەك دەکرێت کە لانی کەم ٧٥٪ حەفتاو پێنج لەسەدای ئەنجومەنەکە (لەگەڵ) پشتگیریی لانی کەم شەش لە هەرێمەکان لەنێو (ئەنجومەنی نیشمانیی هەرێمەکان)دا پەسەندیان کردبێت. قانوونەکەی مافەکانیش- بابەتی دوو گۆڕانکاریی- تەنها دەکرێ هەمواربکرێت لەلایەن لانی کەم ٣/٢ دوو سێیەکی (ئەنجومەنەکە)و بە پشتگیریی لێکردنی لانی کەم شەش لە هەرێمەکان لە (ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمەکاندا) (بەشی (٢) ٧٤).

گۆڕینی دیکە کە (١) پەیوەستن بە ئەو بابەتانەی کار لە ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمەکان) دەکەن، یاخود (٢) سنووره هەرێمایەتییەکان، کارو ئەرکەکان، یان دەزگەو کۆمەڵە یاساو پەیرەوەکان دەگۆڕن، وەیان (٣) هەموارکردنی ماددەیەك کە بەشێوەیەکی تایبەتی پەیوەستبێ بە کاروبابەتێکی هەرێمایەتییەوە، ئەوانیش پێویستیان لانی کەم بە پشتگیریی دوو سێیەکی ٣/٢ نێو

(ئەنجومەنەکە) هەیە لەگەڵ پشتگیریی لێکردنی بەکەمی شەش لە هەرێمەکانی نێو (ئەنجومەنی نیشتمانی هەرێمەکان)دا.

پێزانین‌و داننان بە رۆڵی دەستووریی سەرکردە تەقلیدیی‌و دێرینەکان‌و هەروەها بەمافی بڕیاردانی چارەی خۆنووسین (بەشی ٢٣٥) نیشانەیەکی تایبەتی سەیرو سەرنجراکێشی دەستووری ئەفریقیای باشوورە.

دەستوورەکە دەرك بەوە دەکات‌و دەیسەلمێنێ کە دەسەڵاتی تەقلیدیی دێرین پێش هاتنی ئیستعماری (داگیرکردن) ئەورووپی بۆ ئەفریقیای باشوور دەکەوێتەوە. بۆ باشترکردنی ئەو گرژییە هەستپێکراوەی کە لە زۆر پابەندبوونی خۆماڵیی ئەفریقیا بە تەقلیدە کۆنەکان‌و سرووشتە پاتریارکییە زۆردارییەکەیەوە سەرچاوە دەگرێت لەلایەك‌و، هەڵوێست‌و خوونەریتیی کۆمەڵی نەتەوەیی دیموکراتی خوازو مۆدێرن‌و یەکسانیخوازی دەستوورەکە لەلایەکی ترەوە، (ئەنجومەنێکی سەرکردە تەقلیدییەکان) پێکهێنراوە (بەشی ٢١٢). ئەندامەکانی لەلایەن (ئەنجومەنە هەرێمایەتییەکانی سەرکردە تەقلیدییەکانەوە) دادەمەزرێن. وەك لە (بەشی (٢) ٢١٢)ی دەستووردا هاتووە،و بۆیان هەیەو دەکرێ دووبارە دابنرێنەوە. هەروەها لەسەر ئاستی هەرێمایەتیشدا (ئەنجومەنەکانی سەرکردە تەقلیدییەکان) پێکهێنراون. لەگەڵ ئەوەشەوە، ئەوە روونە کە قانوونی نەریتیی کۆمەڵایەتی (نەك یاسایی)و سەرکردە تەقلیدییەکان

بەشێوەیەکی سەرەکیی دەسەلاتی ئەوەیان پێدراوە کە رۆلیکی رەمزیی و ئامۆژگاریی بگێڕن و سەرکردایەتیی تەقلیدیی بەندە بە چاپتەری (بەش) ١٢ی دەستوورەکەوە.

سەبارەت بە مافی بڕیاردانی چارەی خۆنووسین کە ئێجگار هەستیارەو مشتومڕی زۆریشی لەسەرە- بە زۆریش لە کاردانەوەدا بەرامبەر ئەفریکانۆ هەرە راسترەوەکانداو هەندێ پێکهێنەری تایبەت لەنێو (IFP) پارتی سەربەستی ئینخاتادا- دەستوورەکە هیچ رێگریی و ئاستەنگێکی نەخستۆتە پێش (داننان بە مافی بڕیاردانی چارەیخۆنووسین بۆ هەر کۆمەلێکی هاوبەش لە میرات و بۆماوەیی زمانەوانیی و کەلتووریی لەنێو سنووری یەکەیەکی هەرێمایەتی لە کۆمارەکەدا، یان بەهەر رێگەیەکی تر کە ئەنجومەنی یاسادانان بڕیاری لەسەر دابێت. (بەشی ٢٣٥).

٣- ( **هێزە بزوێنەرەکانی رامیاریی سەردەم** )

چوار کێشەگەلی پلە جیاواز کە بوونەتە گرفتی سەرەکیی لەبەردەم پەرەسەندنی دەستوورییدا مشتومڕیی سیاسیی ئەفریقیای باشووری لەسالی (٢٠٠١)ەوە داگیرکردووە، ئەم کێشانەش ئەمانەن:

١. دەرنجامەکانی دادگایکردنی ناسراو بە گروتبووم (Grootboom Judgement) لەلایەن دادگەی دەستوورییەوە.

٢. بە دەستووریی بوون (دەستوورییەتی) قانونی رێگەپێدان بە سەنگەرگواستنەوە لە دەنگدانی نێو هۆڵی پەرلەماندا.

٣. درێژەپێدانی باس‌وخواسی بەربلاوی داستانی سیاسەتی بوێرانەی بەرەنگاربوونەوەو لەنێوبردنی نەخۆشی (ئایدز)و هۆکارەکانی.

٤. دوای هەموانیش، بە سیاسیی کردنی پرۆگرامە گشتگیرەکەی حکومەت سەبارەت بە دابینکردنی بودجەو پێداویستییەکانی بەرگریکردن.

ئەم چوار کێشە جۆراوجۆرانە کاریگەری جوداوازیان بەسەر پێوەندییە فیدرالییەکانەوە لە ئەفریقیای باشووردا هەبووە. لە ٢٩ی ئاياری ٢٠٠١دا دادگەی دەستووریی پشتگیریی لە بڕیارێکی (دادگەی بالای کاپ) کرد کە سروشتی یاسای مافەکانی ئەفریقیای باشوور دەولەت ناچار دەکات پشتگیریی ئەوەی دوهەمی مافەکانی (کۆمەلایەتی- ئابووریی) هاونیشتمانییان بکات. مالەکەی خاتوو ئارینا گروتبووم (Ms.Irena Grootboom) کە ئەندامی کۆمەلگەیەکی زۆر هەژاری شاکنشین بوو لە (کاپی خۆرئاوادا) رووخێنرا تا کاریگەریی هەبێت بەسەر بڕیاری دادگەوە بە دەرکردنی کرێچی لەبەر نەدانی پارەی کرێ یان پەیمان شکاندن وەیا نیشتەجێبوونی نایاساییو، برەو بدات بەو بڕیارەدا.

دادگە بۆی دەرکەوت کە لەسەر دەولەت پێویست بوو کار بۆ چاککردنی باری دژوارو کێشەکانی ئەو ژمارە زۆرانەی هاوولاتیان

بکات کە لە هەلومەرجی ئێجگار ترسناکدا لـە سەرانسەری ولات ژیـان دەبەنەسـەر بـەپێی توانـاو ئەوەنـدەی بـۆی دەلۆیـت بـۆ دابینکردنـی شـوێنی نیـشتەجێبوون دەسـتی یارمـەتیی‌و هاوکـاریکردنی بـۆ هاونیشتمانییان درێژ بکات.

بڕیارەکـەی دادگـە لـەوەدا زۆر بڕبایـەخ‌و گـرنگ بـوو کـە ملکەچـبوونی دەولـەتیی– لـە سـنووری دیـاریکراودا– داهێنـا بـۆ پەرەپێـدان‌و زیـادکردنی مافـە کۆمەلایـەتی‌و ئابوورییـەکان ئەمـەیش کاریگەرییەکی گرنگ‌و دیاری دەبێت بەسەر حکومەتی ناوەندەوە کـە هەر خۆی لەرووی داراییەوە دەستکورت‌و کەم دەرامەتیشە !

چوار دەستپێشکەریی‌و گۆڕینی یاسازی:–

١. یاسـای سـالی (٢٠٠٢) بـۆ هـەموارکردنی دەسـتووریی کۆمـاری ئەفریقیای باشوور.
٢. یاسای سالی (٢٠٠٢)ی دوهەم هەموارکردنی دەستووریی کۆماری ئەفریقیای باشوور.
٣. یاسای سالی (٢٠٠٢) بۆ هەموارکردنی پێکهاتنـە شـارەوانییەکانی حکومەتی خۆجێیی.
٤. هـەروەها یاسـای سـالی (٢٠٠٢)ی هـەموارکردنی لـە دەسـتدانی توانای مانەوەی ئەندامیەتی پێکهاتەکان.

ئەمانە کە هەر چواریان بەدوای ئەوەدابوون بەیاسا بـۆ ژمارەیـەکی زۆری ئەنـدامانی ئەنجومـەنی یاسـادانان بگـونجێنن کـە پێوەنـدیی

ئەندامبوونیان لەنێو پارتەکانیاندا نەپچڕێنن- واتا (دژی سەنگەر گواستنەوە لەنێو هۆڵی پەرلەماندا) مەسەلەی (مافی سەنگەر گواستنەوە لە هۆڵی پەرلەمان) گرنگە چونکە بە واتای گۆڕانکاریی و گواستنەوەی هێزی سیاسیی دێت. گۆڕانکاریی لە ئەندامییەتی حزبایەتیدا روویدا لەدوای یەکگرتنەوەیەکی زووتر لەنێوان حزبە سیاسییەکانی ئۆپۆزسیۆندا (بەرهەڵستکار) (پارتی دیموکراتی (DP)و پارتی نیشتمانیی (پێشتر) (کە ببوە پارتی نیشتمانیی تازە (NNP) بۆ دامەزراندنی (هاوپەیمانیی دیموکراتی (DA)، بەڵام سەری نەگرت و زۆری نەخایاند. لەجیاتی ئەوە، NNP ئەوەی هەڵبژارد بچێتە نێو هاوپەیمانییەك لەگەڵ ANC کۆنگرەی نیشتمانیی ئەفریقاییدا بۆ پێکهێنانی یەکێ لە بچوکترین حزبی بەرهەڵسکار (برافی دیموکراتیی یەکگرتوو (UDM) بۆ رووبەڕووبوونەوەی یاسای (مافی سەنگەر گواستنەوەی نێو هۆڵی پەرلەمان) لە دادگەی دەستووریدا. دادگەکە بڕیاریدا کە ئەو (مافە) شتێکی نادەستووریی نەبوو لەسەر ئاستی حکومەتی ناوچەییدا، بەڵام قانونەکان کە لەسەر ئاستی هەرێمایەتی و نیشتمانییدا دەرچوێنرابوون بەخراپی دەرچوێنرابوون. بەراستکردنەوەی ئەم ناتەواویی و کەموکورتیانە لەمانگی (کانوونی دووەمی ٢٠٠٣)دا، بەپێدانی مۆڵەتێکی دووهەفتەیی لەمانگی نیسانی ٢٠٠٣دا نوێنەران رێگەیئەوەیان پێدرا کە سەنگەری خۆیان لەنێو پەرلەمان بۆ پارتە

سیاسییەکانی تر بگوازنەوە. لەئەنجامی ئەمەدا کورسییەکانی (ANC) کۆنگرەی نیشتمانیی ئەفریقیایی لە ئەنجومەنی نیشتمانییدا لە (٢٦٦) کورسی بۆ (٢٧٥) کورسی زیادی کرد کە دەیکردە (٦٨,٨٪) لەکۆی گشتیی و زۆرینەیەکی پتر لە ٢/٣ دووسێیەك. هەروەها بووە مایەی ئەوەی کە (هاوپەیمانییە دیموکراتییەکە) بووە بەرهەڵستکاری نوێی فەرمی (رەسمیی)، کورسییەکانی لە (٣٨)ەوە بوون بە (٤٦). ژمارەی کورسییەکانی (پارتی نیشتمانیی نوێ NNP) لە (٢٨) کورسییەوە بۆ (٢٠) بیست کورسیی دابەزی.

لەسەر ئاستی شارەوانییدا بە (سەنگەر گۆڕینەکەی) ئۆکتۆبەری ٢٠٠٢ ANC لەکۆی (٥٥٥) دەنگو لایەنگرانی پارتەکانی دیکەوە (کە ٤١٧ یان لەوانە (راوێژکارانی هاوپەیمانیی دیموکراتیی DA بوون) بۆ خۆیانیان بردن، لەکاتێکدا (٢٤٠) دەنگی لایەنگرانی DA چوونە ریزی (NNP) پارتی نیشتمانیی نوێوە. شتێکی سەیرو سەرنجراکێشە کە لەهەموو ئەمانەدا، پارتەکەی ئەپارتهاید– پارتی نیشتمانیی (کەناوی خۆی گۆڕیبووو کردبووبە پارتی نیشتمانیی نوێ) بۆ ئەوەی نیشانی بدات کە گۆڕاوە)،

بەمەبەستی رێککەوتن لەسەر حکومەتێکی هاوبەش پەیامێکی بەست لەگەڵ ANC دا (کۆنگرەی نیشتمانیی ئەفریقاییدا) (ئەو گرووپەی کە هەر بۆ بەرهەڵستیکردنی سیاسەتی ئەپارتهاید دامەزرێنرابوو).

پیادەکردنی سیاسەتی ئابووریی قەبەو زل سەرەنجام بووە هۆی هەلاوسان لە ولاتدا بەڕێژەی (٣-٦) لەسەدا لەو رادەیەی (بانکی پاشەکەوت) بۆ سالی ٢٠٠٢و ٢٠٠٣ داینابوو، هەروەکو بووە مایەی چاکبوونو بەرەودان بەپارەو دراوی ولاتدا. لەگەلّ ئەوەشەوە، سەرباری هەندێ سەرکەوتنی ئابووریش، دوودلیو نەویستنی سەرۆك میباکی (President Mbeki) بۆ بەئاشکراو بێ پێچو پەنا سەرزەنشتکردنی شێوەی مامەلەکردنو چارەسەریی ئاژاوەو پشێویی ئابووریو رامیاریی لە ولاتی زیمبابۆیی (Zimbabwe) دراوسێدا لەلایەن سەرۆك مۆگابییەوە (President Mugabe)و، هەروەها شکستهێنانو سەرنەکەوتنی لە داننان بەبوونی پێوەندیی هۆکاریی لەنێوان ڤایرۆسی HIVو پەتای ئایدزدا (Aids نەخۆشیی نەمانی بەرگری دەستکەوت) لە ولاتێکدا کە یەکێکە لەنێو ئەو ولاتانەی (دنیادا) کە بەرزترین رێژەی تووشبوونیان بەو نەخۆشییە تیادایە، ئەمانە بەردەوام رێبازو ماوەی فەرمانرەواییەکەی شێواندو لەکەداری دەکرد.

بەمەبەستی پالپشتییو بەهێزکردنی هەلوێستی ناوبەدکراوی حکومەت دەربارەی (AIDS/HIV)ەوە، دادگەی دەستووریی لە تەمموزی ٢٠٠٢دا بریارێکی دەرکرد بۆ ناچارکردنی حکومەت بەدابەشکردنی دەرمانی دژ بە پەتایەکە لەسەرانسەری ولاتدا، وێرای

ئامۆژگاریی‌و پشکنینی ئافرەتـان لـە نەخۆشخانە گشتییەکاندا، نـەک تەنها لە ١٨ شوێنە پێشەکی دیاریکراوەکاندا.

هـەروەها ئـەم بڕیـارەی دادگـە نـەک زۆر بـە بـەرفرەوانیی لەلایـەن ئەوانەوە پەسەندو ستایشکرا کە لەگەڵ هەڵوێستی حکومەتـدا لەمـەڕ (HIV/AIDS)ەوە دژو نـاکۆک بـوون، بگـرە هــەروەها ئــەو پانتاییەشــی چەســپاند کــە ژمارەیــەکی لەزیادبوونــدای کاروبــارە رامیارییــەکان راســتەوخۆ لەلایــەن دادگــە دەســتوورییە تازەکــەوە بڕیاریان لێدرابوو.

بەم ئاستەیش Equaiiy بەشێوەیەکی یەکسان، ئەگەر زیـاتریش نەبێ، بڕیارەکانی حکومەت بـە خـستنەگەڕی نزیکـەی (٤٣,٨) بلیـۆن روبیە بۆ بەدەستهێنان‌و کڕینـی چـەک‌و جبەخانـە هێنـدەی تـر بوونـە مایــەی رێکنەکــەوتن‌و مــشتومڕ لەســەر کــردن. بەلەبەرچــاوگرتنی پێداویستییەکانی گەشەکردنی قووڵی ئەفریقیای باشـوور، کـە تیایانـدا چارەسـەرکردنی پـەتای (ئایـدز) لـە لقـە سـەرەکییەکانییەتی، ئـەم بڕیـارە لەلایـەن خـەڵکانێکی زۆرەوە نـاڕەزایی‌و دوژمنایـەتی لێکـرا. لەساڵی ١٩٩٩وە بابەتی چەک بووەتە یەکێ لەکێشە سیاسییە هـەرە ئاڵۆزەکان‌و هۆیەک بۆ تاقیکردنەوەی (لەمەحەکدانی) دیدو بۆچـوونە ئایدیۆلۆژییەکانی (کۆنگرەی نیشتمانیی ئەفریقیایی) لەمەڕ یـەکگرتن‌و پێکەوە گونجانی گشتیی ناوخۆییدا.

لەسێ ساڵی رابردوودا، پرۆگرامی دەستەبەرکردنی چەكو تەقەمەنیی دەنگۆی بڵاوبوونەوەی گەندەڵییەکی بەربادی تەقاندۆتەوە کە وەزیرە دەستڕۆیشتووەکانو فەرمانبەرە حزبییەکانو خەڵکانی جۆراوجۆر تێوەی گلابوون، وەلێ لەئەنجامدا ئەو کۆمیسیۆنانەی کە بۆ توێژینەوە لە قەبارەو تێچوونی پارەی دەستەبەرکردنی چەكو هەروەها یاسایی بوونی پرۆگرامەکە پێکهێنرابوون بێ ئەنجام دەرچوون.

هەروەها پارتییە بەرهەڵستکارەکانیش رایانگەیاند کە بەرهەڵستیکردنی پەرلەمانیی لەسەر دۆزی چەك بەتوندیی لەلایەن ANC (کۆنگرەی نیشتمانیی ئەفریقیایی) فەرمانڕەواوە دەمکوتکرابووەوە.

جا، بۆ زیاتر لێڵ کردنی ئاوەکەوە، لەکاتی نووسینی ئەم بابەتەدا (نۆڤەمبەر– تەشرینی دووەمی ٢٠٠٢) دەنگی زۆر هەبوون کە (حاکمی گشتیی دەستەی دادخوازی)– بولیلانی نگوکا ( Bulelani Nguka) سیخوڕێکی (جاسووس) ئەپارتهاید بووە، هەروەها بازرگانانی ئەندام لە حزبەکان ئێستا لەسەر گەندەڵییو بەدرەفتارییو بەرتیل خواردن رووبەرووی توێژینەوەو لێپرسینەوە بوونەتەوە.

ئەو ناکۆکیو مشتومڕانە کۆمەڵگەی سیاسیی دابەشکردووەو هەندێ لە کورتهێنانو سەرنەکەوتنەکانو گرژییەکانی نێو حکومەت دەخەنەڕوو.

لەراستییدا، بە لەبەرچاوگرتنی سەختی (شان دانەبەر)و چارەسەرکردنی ئەو هەموو گرژییو دووبەرەکیی یەی نێوان دەستەو تاقمەکانی نێو هاوپەیمانیی ANC (کۆنگرەی نیشتمانیی ئەفریقاییدا) بەتایبەتیش بە پێوەندیی لەگەڵ کارداو، لەئارادانەبوونی هیچ بەرهەڵستکارێکی بەهێزی راستەقینە، ANC (کۆنگرەکە) لەوانەیە مانا بباتە بەر کەلتوورێکی لایەنگریی خزم خزمێنەو واسیتەکارییو بەرتیل دان بەمەبەستی گێڕانەوەی یەکگرتوویی و پێکەوە گونجانی ناوخۆیی حزبیو، بەو شێوەیە رێ لە سەرهەڵدانی هێزێکی کۆمەلایەتی بەرهەڵستکاری رکابەر بگرێت.

**٤- سەرچاوەو ژێدەر بۆ زانیاری لەمەودوا:**

١. ئێلمان، ستیڤن (لەگەڵ پێنلۆپ ئەندرون)- دەستوورەکانی دوای ئەپارتهاید، چاپخانەی زانکۆی ویتوۆتەرسراند، وچاپخانەی زانکۆی ئۆهایۆ،ساڵی ٢٠٠١.

٢. ئێریکسۆن، نیك- سیاسەت لە ئەفریقیای باشووردا، ٢٠٠١- ٢٠٠٢ جۆهانسبۆرگ، پەیمانگەی ئەفریقیای باشوور بۆ پێوەندییە ئەژادییەکان، ٢٠٠٢.

٣. سپارکس، ئەلیستێر، لەدەرەوەی پەرجووەوە ( Beyond the Miracle) کالیفۆرنیا، چاپخانەی زانکۆی کالیفۆرنیا- ٢٠٠٣.

٤. هی تریش.

## خشتەی (١)

## هێما رامیاریی و جوگرافییەکان

| | |
|---|---|
| شاری پێتەخت | پریتۆریا Pretoria City تێبینی: کێپ تاون Cape Town مەڵبەندی یاسادانان و (بلویمفۆنیتن) Bloemfontein مەڵبەندی دادگەرییە. |
| ژمارەو جۆری یەکە پێکهێنەرەکان | ٩ نۆ هەرێم: ئیسترەن کێیپ، فری ستەیت، گۆوتینگ، کوازولو-ناتال، لیمپۆپۆ (پێشتر نۆرزەرن پرۆڤینس بوو)، مپومەلانگە، نۆرث وێست، نۆرزەرن کێیپ، وێستەرن کێیپ. |
| زمانە فەرمییەکان | ئەفریقانی، ئینگلیزیی، ئیسیندەبێلا، ئیسیخۆسا، ئیسیزۆلو، سیپێدی، سیسۆثۆ، سیتسوانا، سیسواتی، تشیڤێنداو خیتسۆنگە. |
| رووبەر | ١،٢١٩٠٩٠ کیلۆمەتر دوجا |
| رووبەر- گەورەترین یەکەی پێکهێنەر | کێیپی باکوور- ٣٦١٨٣٠کم٢ |
| رووبەر- بچووکترین یەکەی پێکهێنەر | گۆوتینگ- ١٧٠١٠کم٢ |
| کۆی دانیشتووانان | ٤٢،٥٨٠،٠٠٠ ملیۆن، ساڵی (٢٠٠٢). |
| دانیشتووانانی یەکە پێکهێنەرەکان رێژەی سەدی بۆ کۆی گشتیی | کوازولو- ناتال ٢١٪، گۆوتینگ ١٩،٧٪، ئیستەرن کێیپ ١٤،٢٪، هەرێمی باکوور (لیمپۆپۆ ١١،٨٪، وێستەرن کێیپ ١٠،١٪، نۆرث وێست ٨،٢٪، فری ستەیت |

سیستمی فیدڕالی لەچەند وڵاتێکی جیهاندا ٢٠٠٥

| | |
|---|---|
| | ٦٪، نۆرزەرن کێیپ ١,٨٪. |
| سیستمی سیاسیی- فیدراڵی | کۆماری- سیستمی پەرلەمانیی |
| سەرۆکی دەوڵەت- فیدراڵی | سەرۆك ( Thabo Mvuyelwa Mbeki- ساڵی ١٩٩٩) کۆنگرەی نیشتمانیی ئەفریقیایی (ANC)، لەلایەن ئەنجومەنی نیشتمانیی بۆ خولێکی پێنج ساڵەی حوکم هەڵبژێردراوە. |
| سەرۆکی حکومەت- فیدراڵی | سەرۆك ( Thabo Mvuyelwa Mbeki) سەرۆك کابینەکە پێکدێنێت (وەزیرەکان دادەمەزرێنێت). |
| پێکهاتەی حکومەت- فیداڵی | پەرلەمانیی جووت ئەنجومەنی ئەنجومەنی باڵا (Upper House)- ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمەکان (NCOP)، ٩٠ نەوەد کورسیی. ئەم ئەنجومەنە لە ٥٤ ئەندامی دائیمیو ئەگۆڕو ٣٦ ئەندامی نوێنەری تایبەتی کە بۆماوەی ٥ پێنج ساڵان هەڵبژێردراون پێکهاتووە. Lower House- ئەنجومەنی نیشتمانیی، ٤٠٠ کورسیی نوێنەران لەسەر بنەمای سیستمی نوێنەرایەتیکردنی ڕێژەییو لیستی حزبایەتی هەڵدەبژێردرێن (٢٠٠ کورسیی لە لیستی هەرێمایەتییەوە |

| | |
|---|---|
| | هەڵدەبژێردرێن‌و ٢٠٠ کورسیش لە لیستێکی نیشتمانییەوە) بۆ خولێکی پێنج ساڵیی. تێبینی: لەسەر ئاستی فیدرالییەوە ئەنجومەنێکی سەرکردە تەقلیدییەکانیش هەیە، ئەندامانی لەلایەن (ئەنجومەنە هەرێمایەتییەکانی سەرکردە تەقلیدییەکان)ەوە دادەنرێن. |
| ژمارەی نوێنەران لە ئەنجومەنی Lower House ی حکومەتی فیدراڵی لە یەکە پێکهێنەرە خاوەن زۆرترین دانیشتووانەکاندا | تێبینی: لەبەرئەوەی کە هەڵبژاردن بەشێوازی نوێنەرایەتی ڕێژەیی‌و سیستمی لیست بەڕێوەدەچێ، بۆیەکان نوێنەران سەر بەکام یەکە پێکهێنەرەکانن بایەخێکی ئەوتۆی بۆ نییە. |
| دابەشبوونی نوێنەرایەتیکردن لە ئەنجومەنی باڵای حکومەتی فیدراڵیدا | هەریەک لە (٩) هەرێمەکان (١٠) دە کورسیی هەیە. |
| دابەشکردنی دەسەڵاتەکان | دەستوور بەرپرسیاریەتییەکان بۆ حکومەتە نیشتمانیی‌و هەرێمایەتی‌و ناوخۆییەکان لەسەر بنەمای پرەنسیپی حوکمکردنی هاوبەشیی لەنێوان ئەم سێ جۆرەی حکومەتدا دیاریدەکات. حکومەتی فیدراڵ (نێوەند) بەرپرسە لە دابینکردن‌و چەسپاندنی ئاسایشی نەتەوەیی، یەکێتی ئابووریی‌و پێوەرە نیشتمانییە سەرەکییەکان. حکومەتە |

| | |
|---|---|
| | فیدراڵو هەرێمایەتییەکان پێکەوە بەرپرسیارن لە ٣٢ سیوسێ بابەتگەلی وەك پلاندانانو نەخشەکێشانی هەرێمایەتیو پەرەپێدان، قانوونی خۆجێییو دابونەریتیی باو، خوێندنی قوتابخانە، تەندروستی، ڕەفاهیەتو چاککردنی باری گوزەرانی خەڵکیو خانووبەرە دروستکردن-نیشتەجێبوون. لە واقیعدا حکومەتی ناوەند (فیدراڵ) بڕیار لەسەر سیاسەتی وڵات دەداتو حکومەتەکانی هەرێمەکانیش لە جێبەجێکردنی بەرپرسیارن. لەحاڵەتی ڕوودانی ناکۆکیی لەنێوان قانوونی فیدراڵو قانوونی ویلایەتدا سەرپشکیی بۆ قانوونی فیدراڵە. لیستێکی کورتیش هەیە تایبەت بە دەسەڵاتەکانی هەرێم. کە ئەمانە لەخۆ دەگرێت: کاروبارەکانی کوشتارگە (قەسابخانەکان)، ڕێگاوبان، تەندروستی، وەرزش، کەلتوورو فەرهەنگو بەیتەریی (نوشدرایی ئاژەڵی). |
| دەسەڵاتەکانی تر (پاشماوەکان) | پاشماوەی دەسەڵاتەکانیش بۆ حکومەتی فیدڕاڵ دەگەڕێتەوە. |
| دادگەی دەستووریی (باڵاترین دادگە- | دادگەی دەستووریی: ١١ یانزە دادوەریی |

## سیستمی فیدراڵی لەچەند وڵاتێکی جیهاندا ٢٠٠٥

| | |
|---|---|
| لـــە کاروبـــارە دەســـتوورییەکان) دەکۆڵێتەوە. | هەنە، ٩ نۆ پیاوو دوو ژنن. دادوەرەکان بۆمـاوەی دوانـزدە سـاڵ دەمێننـەوەو نوێکردنـەوەیان بـۆ نییـە وەلێ پێویسـتە لەتەمەنی (٧٠) حەفتا ساڵیدا خانەنشین بکرێن. |
| سیستمی سیاسیی یەکە پێکهێنەرەکان | ئەنجومەنی یاسادانان لـەنێوان (٣٠) سـی هـەتا (٨٠) هەشـتا ئەنـدام پێکـدێت کـە بـــەرێگای نوێنەرایـــەتیکردنی رێـــژەیی هەڵدەبـژێردرێن. ژمـارەی ئەندامـەکان بەپێی ئـەو مەرجانـەوە دیاریـدەکرێن کـە ئەنجومـــەنی یاســـادانانی نیـــشتمانیی دایاندەنێت. (تێبینـــــی: خانـــــەی ســـــەرکردە ئەقلیدییەکانیش پێکهێنـراوەو سـەرکردە ئەقلیدییەکان رۆڵی ئامۆژگاریی دەگێڕن). |
| سەرۆکی حکومەت– یەکەی پێکهێنەر | سـەرەك وەزیـران، لەلایـەن ئەنجومـەنی یاسادانانی هەرێمەوە هەڵدەبژێردرێت. |

## خشتەی ژمارە (۲)

## هێما ئابووریی و کۆمەلایەتییەکان

| | |
|---|---|
| کۆی گشتیی داهاتی سالانە | ٤٤١,٦ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی (۲۰۰۲) |
| پشکی تاك لە داهات | ۱۰۱۳۲ دۆلاری ئەمریکی (۲۰۰۲) |
| قەرزی نیشتمانیی (دەرەکی) | ۲٤,۱ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی (۲۰۰۱) |
| قەرزی ناراستەوخۆ (لاوەکی) نیشتمانیی | ۸۲,۱ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی (۲۰۰۱) |
| ڕێژەی بێکاریی لەسەر ئاستی نەتەوە | ۲۹,۹٥٪ (۲۰۰۲) |
| یەکەی پێکهێنەری خاوەن بەرزترین ڕێژەی بێکاریی | لیمپۆپۆ (هەرێمی باکوور) ۳٦,۷٪ (۲۰۰۲) |
| یەکەی پێکهێنەری خاوەن نزمترین ڕێژەی بێکاریی | کاپی خۆرئاوا ۱۸,٦٪ (۲۰۰۱) |
| ڕێژەی خوێندەوارانی هەرزەکار | ۸٥,٦٪ (۲۰۰۱)<br>(لەتەمەنی ۱٥ پانزە سالی و بەسەرەوە) |
| خەرجیی نەتەوەیی بۆ پەروەردەو ڕێژەی سەدی بۆ کۆی گشتی داهات | ٥,٥٪ (۱۹۹۸- ۲۰۰۰) |
| هیوای ژیان (بەسال) | ٥۰,۹ (۲۰۰۱) |
| داهاتی حکومەتی فیدرال لە گومرگو سەرچاوەگەلی هاوپێوەند | ۳۰,۷ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی (۲۰۰۰-۲۰۰۱) |
| داهاتی یەکە پێکهێنەرەکان لە گومرگو سەرچاوە هاوشێوەکان | ۸,٤ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی (۲۰۰۰-۲۰۰۱)<br>(تێبینی: ئەم ژمارەیە ئاماژە بە داهاتەکانی حکومەتە هەرێمایەتییەکانو حکومەتە خۆجێییەکان دەکات. |

| | حکومەتە خۆجێییەکان دەسەڵاتی بەرزکردنەوەی داهاتی پتریان هەیە لە حکومەتە هەرێمایەتییەکان) |
|---|---|
| یارمەتییەکانی فیدراڵ بۆ یەکە پێکهێنەرەکان | ١٦,٢ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی (٢٠٠٠-٢٠٠١) |
| میکانیزمەکانی هاوسەنگیی (یەکسانی) کردن | یارمەتییەکانی حکومەتی فیدراڵ بەپێی بنەماکانی کۆمیسیۆنی دارایی‌و کۆمیسیۆنی تایبەت بە خەزینەی میریی دەبێت. |

## لە بەرهەمە چاپکراوەکانی وەرگێر:

١. خودموختاریی هەرێمایەتیی بۆ کەمینە نەتەوەییەکان لەچین- ٢٠٠٦.

٢. یاسای زمانە فەرمییەکان لەچەند وڵاتێکی فرەزماندا- ٢٠٠٧.

٣. سیستمی فیدراڵیی لەچەند وڵاتێکی جیهاندا- ٢٠٠٨

# پێرست